رۆمان

ENGESE

پاولۆ کۆیلۆ

# دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە:
سیروان مەحمود



پاولۆ کۆیلۆ

دەستنووسە دۆزراوەکەی

# ئەکرا




وەرگێرانی:

سیروان مەحمود




ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن

بەڕێوەبەری هونەری: باسم رەسام

ناوی کتێب: دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا

ناوی نووسەر: پاولۆ کۆیلۆ

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سیروان مەحمود

بابەت: ڕۆمان

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٣

چاپخانە: رجایی / تاران

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (٦٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٩٢١)ـی ساڵی (٢٠١٣)ـی پێدراوە

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:

Manuscript Fund In Accra

Paulo Coelho, T.By: Margaret Jull Costa

Harper Collins Publisher, London, 2013

ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

ئای مریەم، بەبێ تاوان سکت پڕبوو،

نزا بۆ ئەوانە بکە کە ڕوویان تێ کردیت. ئامین

پێشکەشە بە ن.ر.س.م.،

لە سوپاسگوزاری پەرجوویەکدا،

بە مۆنیکا ئەنتۆنیسیش،

کە هەرگیز پیرۆزییەکانی خۆی بەهەدەر نادات

ئەی کچانی قودس بۆ من مەگرین،

بۆ خۆتان و بۆ منداڵەکانتان

بگرین.

*لوقا* ٢٣:٢٨

# پێشەکی و سڵاو

لە دیسێمبەری ١٩٤٥، دوو برا، کە بە دووی شوێنێکدا دەگەڕان تا لێی بحەوێنەوە، لە ئەشکەوتێکی ناوچەی شانشینی حەمرای میسری ژووروو، سندوقێکیان دۆزییەوە، کە پڕبوو لە پارچە دەستنووسی دێرین. لەجێی ئەوەی پەیوەندی بە دەسەڵاتی خۆجێییەوە بکەن -کە یاسا وای دەخواست- بڕیاریاندا لە بازاڕەکە یەك یەك بە نرخی کەلوپەلی دێرین بیانفرۆشن، بەو شێوەیەش سەرنجی حکومەتیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا. دایکی کوڕەکان، کە ترسی "وزەی نێگەتف"ی هەبوو، چەند دانەیەکی لەوانە سووتاند.

ساڵی داهاتوو، لەبەر هۆکارگەلێك مێژوو تۆمار نەکرا و براکان ناکۆك بوون. لەبەر ئەم ناکۆکییە "وزە نێگەتفی"یە، دایکەکە دەستنووسەکانی برد بۆ قەشەیەك و ئەویش فرۆشتنی بە مۆزەخانەی قبتیە لە قاهیرە. لەوێ دەستنووسەکان ئەو ناوەیان پێ بەخشرا کە هەتا ئەم ڕۆژەش لەگەڵیاندایە: دەستنووسەکانی ناگ حەمادی (سەرچاوەیەك بۆ نزیکترین شارۆچکەی ئەشکەوتەکان کە ئەو دەستنووسانەی لێ دۆزرایەوە). یەکێك لە

پسپۆڕەکانی مۆزەخانەکە، مێژوونووسی ئایینی جین دۆڕێس، گرنگی ئەو دۆزینەوەیەی بۆ دەرکەوت و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٨ لە چاپ و بڵاوکردنەوەدا باسی کرد.

دەستنووسی دیکە لە بازاڕی ڕەش دەرکەوتن. حکومەتی میسر هەوڵی دا بردنە دەرەوەی دەستنووسەکان قەدەغە بکات. لەپاش شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٥٢، زۆرینەی شتەکان گوێزرانەوە بۆ مۆزەخانەی قبتیە لە قاهیرە و وەك بەشێکی ئاسەواری نیشتمانی ڕاگەیەندرا. تەنها یەك نووسراویان لەدەست دەرچوو، ئەویش لە دوکانێکی ئەنتیکی بەلجیکادا بوو. لەپاش هەوڵێکی بێ سوود بۆ فرۆشتنی لە نیویۆرك و پاریس، لەکۆتاییدا لە ساڵی ١٩٥١ لەلایەن دانیشتگەی کارڵ جەنگەوە وەرگیرا. لەپاش مردنی توێژەرەوەی دەروونی بەناوبانگ، دەستنووسەکەی بە جەنگ کۆدێکس ناسرابوو، گەڕێندرایەوە بۆ قاهیرە، کە لەوێ نزیکەی هەزار پارچە نووسراو و دەستنووسی ناگ حەمادی تری لێ دەست دەکەوێت.

***

دەستنووسەکان تێکستی وەرگێڕدراوی یۆنانین، کە لە نێوان یەکەم سەدەی پێش مەسیح و ١٨٠ی دوای مەسیحدا نووسراون، ئەوانە کۆمەڵە کارێکن، کە بە ئینجیلەکانی ئەپاکریفاش ناسراون، چونکە ئەوانە لەو ئینجیلەدا نین، کە ئەمڕۆ ئێمە بەکاری دەهێنین. ئەی بۆچی بەو شێوەیەیە؟

لە ساڵی ١٧٠ی پاش مەسیح کۆمەڵێك قەشە چاویان بەیەکدی کەوت تا بڕیار بدەن کام نووسراو بکەنە بەشێك لە پەیمانی نوێی ئینجیل. پێوانەکە تەواو ئاسان بوو: هەر شتێك، کە بۆ بەرەنگاری گومڕاکان و ڕێبازە دابەشبووەکانی ئەو سەردەمە بەکاربهێنرێت دادەنرێت. ئەو چوار

ئینجیلانەی ئەمڕۆ لەبەردەستی ئێمەدان هەڵبـژێردران، هـەر وەك بڵێی پیتی نێردراوەکانن، یـان هـەر شتێکی تـر، کـە هەڵیانسـەنگاندوون، ئێمـە دەڵێین "یـەکگرتوو" کـە قەشـەکان پێیـان وابـووە دەبنـە بـاوەڕی سـەرەکی مەسـیحیەت. ژێـدەری ئـەم چـاوپێکەوتنەی قەشـەکان و کتێبـە هەڵبژێردراوەکانیان لە مۆراتۆریا کانوندا دەدۆزرێتـەوە. کتێبـەکانی تـر، وەك ئەوانـەی لـە نـاگ حـەمادی دۆزرانـەوە، لابـران، یـان لەبـەر ئـەوەی لەلایـەن ژنانەوە نووسرابوون (بۆ نموونە، ئینجیلەکەی مریەم مەجدەلیە)، یـان لەبـەر ئەوەی وەك کەسێك باسـی عیسـا کرابـوو، کـە ئاگـاداری فەرمانەکـەی خـۆی بووە و لە ڕاڕەوی مەرگدا قورسی و ئازاری کەمتر دەبێتەوە.

***

لـە سـاڵی ١٩٧٤، شوێنەوارناسـی ئینگلیـزی، بـەڕێز وۆڵتـەر ویلکینسـەن دەستنووسێکی تری دۆزییەوە، ئەم جارە بە سێ زمان نووسـرابوو: عـەرەبی و عیـبری و لاتینـی. لەبـەر گرنگـی یاسـاکانی پارێزگـاری دۆزینـەوەی لـەو شێوەیە لە هەرێمەکەدا، ڕاستەوخۆ نووسراوەکەی نـارد بـۆ بەشـی شـوێنەوار لە مۆزەخانەی قاهیرە. ماوەیەکی کورت پاش ئەوە وەڵامێك گەڕایـەوە: لانـی کـەم ١٥٥ کـۆپی ئـەو بەڵگەنامەیـە لـە جیهانـدا دەستاودەسـتی کـردووە (مۆزەخانەکە خاوەنی سێ دانەیانـە) هەمووشیان هـەر هـەمان شت بـوون و چونیەك بوون. تاقیکردنەوەکانی کاربۆن-١٤ (کە تەمـەنی مـاددەی ئەنـدامی دیـاری دەکـرد) دەریخسـت، کـە قەواڵەکـە نوێیـە، شیاوانە دەگەڕێتـەوە بـۆ نزیکـی سـاڵی ١٣٠٧. ئاشـکراکردنی ڕەسـەنایەتی تـەواو ئاسـان بـووە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەکرای دەرەوەی ناوچەی میسر. لەبەر ئەوە بـە لـەناوبردنی

شوێنەوارێك لە وڵاتەکەدا لەقەڵەم نادرێت و، بەڕێز وۆڵتەر بە فـەرمی لەلایـەن حکومەتی میسرەوە ڕێگـەی پـێ درا (سەرچاوە: 1901/317/IFP-75، بەرواری ٢٣ی نۆڤەمبەری ١٩٧٤) کە لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ ئینگلتەرا.

***

لە کریسمسی ساڵی ١٩٨٢دا، لە بورسمادوغی ویلز چاوم بـە کوڕەکـەی بـەڕێز وۆڵتـەر کـەوت. بیرمـە باسـی ئـەو دەستنووسـەی کـرد، کـە بـاوکی دۆزیبوویەوە، بەڵام کەسمان گرنگییەکی تایبەتییمان بە بابەتەکە نـەدا. لـەو ساڵانەدا درێژەمان بە پەیوەندییەکەمان دا و لانی کەم لە دوو بۆنەی تـردا لـە ویلز چاوم پێی کەوت، کە بۆ بەرزکردنەوەی کتێبەکانم ڕۆیشتبووم.

لە سی نۆڤەمبەری ٢٠١١دا، کۆپییەکی ئەو نووسراوەم پێ گەیشت کە لـە یەکەم چاوپێکەوتندا باسی کرد. لێرە وەرمگێڕاوە.

زۆر حەزدەکەم بەم نووسینە دەست پێ بکەم:

"ئێستا کە لە کۆتایی ژیانمدام،

لەپێناوی ئەو کەسانەدا دەڕۆم، کە شوێنم کەوتن

هەموو ئەو شتانەی لەکاتی ڕۆیشتنم بە ڕووکاری

زەوییدا فێریان بووم. هیواخوازم سوودیان

لێ وەربگرن".

بەداخەوە، ئەوە ڕاست نییە. من تەنها بیست و یەك سالم، دایك و باوکم خۆشیان ویستووم و پەروەردەیان کردووم، هاوسەرگیریشم لەگەڵ کچێك کردووە، کە خۆشم دەویێت و ئەویش لەبەرامبەردا خۆشی دەویێم. بەهەرحاڵ، سبەی ژیان لێکمان جودا دەکاتەوە و، دەبێت ئێمەش هەر یەکەمان بەدووی ڕاڕەوی خۆماندا بگەڕێین، بەدووی چارەنووسی خۆمان، یان بەدووی ڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگی خۆماندا بگەڕێین.

ئەمڕۆ چواردەی جولای ١٠٩٩یە، کە بۆ خێزانەکەمان گرنگە. بۆ خێزانەکەی یەعقوب، ئەو هاوڕێیەی منداڵیم، کە لە قودس کایەم لەگەڵیدا دەکرد، ساڵی ٤٨٥٩یە — هەمیشە بەشانازییەوە پێمدەڵێت، کە یەهودیەت ئایینێکی کۆنە و لە دیینەکەی من دێرینترە. بۆ ئیبن ئەسیری لێهاتوو، کە تەواوی ژیانی خۆی بۆ هەوڵدانی تۆمارکردنی مێژوو تەرخانکرد، کە ئێستە بەرەو کۆتایی دەڕوات، ساڵی ٤٩٢ خەریکە تەواو دەبێت. ئێمە بە بەروار، یان باشترین ڕێگەی خوداپەرستی قایل نین، بەڵکو بە هەموو ڕێزێکەوە بە ئاشتی پێکەوە دەژین.

هەفتەیەك بەر لە ئێستا، فەرماندەرەکانمان کۆبوونەوەیەکیان ساز کرد. سەربازە فەڕەنسییەکان زۆر لە سەربازەکانی ئێمە بڵندتر و ئامادەباشترن.

هەڵبژاردنێکمان خراپە بەردەست: شارەکە بەجێ بهێڵین، یان تا مردن بجەنگین، چونکە بەدڵنیاییەوە دەبەزین. زۆرینەیان بڕیاری مانەوەیان دا.

لەم ساتەدا موسوڵمانەکان لە مزگەوتی ئەقسا کۆبوونەتەوە، لەکاتێکدا جولەکەکان وایان بەباش زانی سەربازەکانیان لە میحراب داود کۆبکەنەوە –قوللەکەی دەیڤد– مەسیحییەکانیش، کە لە چەندین گەڕەکی جیاوازدا دەژین، بەرگریکردنی باشووری شارەکەیان خراوەتە ئەستۆ.

لە دەرەوە، ئابلۆقەی قوللە دروستکراوەکانی ناو کەشتی دوژمنەکان دەبینین. بە جووڵەکانیاندا وا دیارە سبەی هێرش دەکەن و بەناوی باوکەوە خوێنمان دەڕێژن، "ئازادی" شارەکە و "ویستی پیرۆز".

ئەم ئێوارەیە، لە هەمان ئەو گۆڕەپانەی کە هەزارەیەک پێش ئێستا، پارێزگاری ڕۆمانیا، پۆنتس پیلەیت، عیسای هێنایە ناو جەنجاڵییەکەوە تا لە خاچی بدات، کۆمەڵێك ژن و پیاو، لە هەموو تەمەنێك، ڕۆیشتن تا یۆنانییەکە ببینن، کە لەلای هەموومان بە قبتییەکە ناسراوە.

قبتییەکە پیاوێکی نامۆیە. لە تەمەنی هەرزەکارییدا بڕیاری دا شارەکەی خۆی، ئەسینا، بەجێ بهێڵێت و بڕوا بەدووی پارە و سەرکەشییدا بگەڕێت. لە کۆتاییدا خەریکبوو لە برساندا بمرێت، لە دەرگاکانی شارەکەی ئێمەی دا، کاتێکیش بەباشی بەخێرهاتنی لێ کرا، فیکرەی بەردەوامبوونی گەشتەکەی لە مێشکی خۆی کردە دەرەوە و بڕیاری مانەوەی دا.

لە دوکانی پینەچییەك کارێکی بۆ خۆی دۆزییەوە و –هەر وەك ئیبن ئەسیریش– دەستی کرد بە تۆمارکردنی هەموو ئەو شتانەی دەیبینین و دەیبیستن بۆ نەوەی ئاینده. هەوڵی نەدا خۆی بە هیچ دینێکی

دیاریکراوەوە ببەستێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەس هەوڵی قایلکردنی نەدا. بەو شێوەیەش، ئێستە ئێمە لە ساڵی ١٠٩٩ یان ٤٨٥٩دا نین، بەڵکو زۆر پێشتر، لە ساڵی ٤٩٢ داین. قبتییەکە تەنها بڕوای بە ساتی ئێستە هەیە، کە خۆی پێی دەڵێت مۆریا — خودا نەناسەکە، وزەی پیرۆز، لە تەنها یاسایەك بەرپرسە، کە ئەگەر بشکێندرێت، ئەوا کۆتایی بە جیهان دەهێنێت.

بەتەنیشت قبتییەکەوە سەرکردەی ئەو سێ ئایینەی لێ بوو، کە لە قودس جێگیر ببوون. لە کاتی ئەم گفتوگۆیەدا هیچ کارگێڕێکی میریی لێ نەبوو؛ ئەوانیش خەریکی ئامادەکاری بەرگری بوون، کە ئێمە پێمانوایە بەتەواوەتی بێ حیکمەت بێت.

یۆنانییەکە گوتی، "چەندین سەدە بەر لە ئێستا، پیاوێك لە گۆڕەپانەکە دادگایی کرا و تاوانبار کرا. کاتێك بەرەو مەرگی خۆی دەڕۆیشت، لە ڕێگەی لای ڕاستییەوە بە تەنیشت کۆمەڵێك ژندا تێپەڕی. کاتێك بینی دەگرین، گوتی: "بۆ من مەگرین، بۆ قودس بگرین". پێغەمبەرایەتی ئەوەی دەکرد کە لە ئێستادا ڕوودەدات. لە سبەینێوە، هاودەنگی دەبێتە ناکۆکی. غەم جێی شادی دەگرێتەوە. ئاشتی ڕێگە بۆ جەنگێك خۆش دەکات، کە هەتا داهاتوویەکی تەواو دووری وێنا نەکراو بەردەوام دەبێت".

کەس هیچی نەگوت، چونکە کەسمان بە تەواوەتی نەماندەزانی بۆچی لەوێین. باشە هێشتا دەبوو گوێ بۆ گوتارێکی تر بگرین لەبارەی ئەم داگیرکەرانەوە، کە بە خۆیان دەڵێن "هێرشکەری خاچخوازان"؟

بۆ ساتێك وا دەردەکەوت قبتییەکە تووشی سەر لێ شێوانی ژەنەڕاڵەکە هاتبێت. ئەوجا لە پاش بێدەنگییەکی زۆر، ڕوونیکردەوە:

"ئەوان دەتوانن شارەکە وێران بکەن، بەڵام ناتوانن تەواوی ئەو شتانە وێران بکەن، کە شارەکە فێری کردووین، هەر لەبەر ئەوە گرنگە ئەم زانیارییە هەر بەشێوەی چارەنووسی دیوار و خانوو و شەقامەکانمانی بەسەردا نایەت. بەڵام ئایا زانیاری چییە؟"

چونکە هیچ کەس وەڵامی نەبوو، خۆی بەردەوام بوو:

"ئەوە حەقیقەتی تەواوەتی ژیان و مەرگ نییە، بەڵکو ئەو شتەیە، کە یارمەتیمان دەدات بەسەر بەرەنگارییەکانی ڕۆژانەدا زاڵ بین. ئەمە ئەوە نییە، کە لە کتێبەکانەوە فێری دەبین، کە تەنها خزمەتی ئەو گفتوگۆ بێ سوودانە دەکات لەبارەی ئەوەوە، کە چی ڕوویداوە وچی ڕوودەدات؛ بەڵکو ئەو زانیارییەیە، کە لە دڵی ئەو ژن و پیاوانەدا دەژین، کە خواستی باشیان هەیە".

قبتییەکە گوتی:

"من پیاوێکی فێربووم و هێشتاش، سەرەڕای گوزەراندنی تەواوی ئەو ساڵانە لە وەرگرتنەوەی ئەنتیکە، پۆلاندنی کەرەستەکان، تۆمارکردنی بەروار و گفتوگۆکردنی سیاسەت، هێشتاش بەتەواوەتی نازانم چی بە تۆ بڵێم. بەڵام داوا لە وزەی پیرۆز دەکەم دڵم پاک بکاتەوە. تۆ پرسیارم لێ دەکەیت و منیش وەڵام دەدەمەوە. ئەمەیە کە مامۆستاکانی یۆنانی کۆن دەیانگوت؛ شاگردەکان پرسیارگەلێکیان لەبارەی ئەو کێشانەوە دەکرد، کە هێشتا ڕەچاویان نەکردبوو، ئەوانیش وەڵامیان دەدانەوە".

کەسێك پرسی، "ئەی چی لە وەڵامەکانی تۆ بکەین؟"

"کەسێك ئەوە دەنووسێت، کە دەیڵێم. ئەوانەی تر وشەکانم لەیاد ناکەن. شتە گرنگەکە ئەوەیە، کە ئەمشەو تۆ بەرەو هەر چوار سوچەکەی جیهان بەڕێ دەکەویت و ئەوەی بیستووتە بە خەڵکی ڕادەگەیەنیت. بەو شێوەیەش ڕۆحی قودس پارێزراو دەبێت. ڕۆژێکیش دێت قودس دروست دەکەینەوە، نەك تەنها وەك شارێك، بەڵکو وەك ناوەندێکی زانیاری و شوێنێك کە دووبارە ئاشتی تێدا بەرقەرار بێت".

پیاوێکی تر گوتی، "هەمووان دەزانین چی لە سبەیدا چاوەڕێمانە. باشە وا باشتر نییە باسی ئەوە بکەین، کە چۆن وتووێژ لەسەر ئاشتی بکەین، یان خۆمان بۆ جەنگ ئامادە بکەین؟"

قبتییەکە تەماشایەکی پیاوە ئایینییەکانی تەنیشتی خۆی کرد، ئەوجا لەناکاو ڕووی بۆ جەنجاڵییەکە وەرگێڕا.

"کەس لە ئێمە نازانێت سبەینێ چی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، چونکە هەموو ڕۆژێك ساتی باش و خراپی تێدایە. لەبەر ئەوە، کاتێك پرسیارەکانتان دەکەن، تیپە سەربازییەکانی دەرەوە و ترسەکەی ناوەوە لەیاد بکەن. کاری ئێمە تۆمارکردنی ئەو شتانە نییە، کە لەم بەروارە ڕوودەدات بۆ ئەوانەی کە زەوییان بۆ دەمێنێتەوە؛ مێژوو ئاگای لەوە دەبێت. بەو شێوەیەش، ئێمە قسە لەسەر ژیانی ڕۆژانەمان و ئەو تەنگوچەڵەمانە دەکەین، کە ڕووبەڕوویان بووینەتەوە. داهاتووش هەر بایەخ بەمە دەدات، چونکە لەو بڕوایەدا نیم لە ماوەی هەزار ساڵی داهاتوودا زۆر گۆڕانکاری ڕووبدەن".

ئەوجا یەعقوبی دراوسێم گوتی:

"باسی بەزین و بەرەنگاریمان بۆ بکە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

ئایا گەڵا، کاتێك لە زستاندا لە دارەکە دەکەوێتە خوارێ، هەست دەکات باکە بەزاندوویەتی؟

دارەکە بە گەڵاکە دەڵێت: "خولی ژیان بەو شێوەیەیە. ڕەنگە تۆ پێتوابێت دەمریت، بەڵام لە مندا زیندووی. بۆ زیندوێتی خۆم سوپاسی تۆ دەکەم، چونکە بەبۆنەی تۆوە دەتوانم هەناسە بدەم. هەروەها سوپاست دەکەم بۆ ئەوەی کە هەستم بە خۆشویستنی خۆم کرد، چونکە بەبۆنەی تۆوە بوو، کە دەمتوانی سێبەر بۆ گەشتیارە ماندووەکان دابین بکەم. وزەت وزەی منە؛ ئێمە هەردوو یەکین".

ئایا پیاوێك، کە چەندین ساڵ بۆ خۆئامادەکاری بۆ سەرکەوتن بە بەرزترین چیای جیهاندا بەسەردەبات، هەست بە بەزین دەکات، کاتێك دەگاتە سەر لووتکەی چیاکە و بۆی دەردەکەوێت سروشت لووتکەکەی بە هەوری گەردەلوول داپۆشیووە؟ پیاوەکە بە چیاکە دەڵێت: "ئەم جارە پێویستت بە من نییە، بەڵام کەش دەگۆڕێت و منیش ڕۆژێك دەگەڕێمەوە و

بە لووتکەکەت دەگەم. لە هەمان کاتدا، تۆ لێرەیت و چاوەڕوانی من دەکەیت".

ئایا کاتێک پیاوێکی گەنج، لەلایەن یەکەم خۆشەویستییەوە ڕەت دەکرێتەوە، پێی وادەبێت و ڕایدەگەیەنێت، کە خۆشەویستی بوونی نییە؟ پیاوە گەنجەکە بە خۆی دەڵێت: "کەسێکی باشتر دەدۆزمەوە، کە لە هەستەکانم تێ بگات. ئەوجاش لە باقی ڕۆژەکانمدا شادمان دەبم".

لە خولی سروشتدا شتێك نییە بەناوی سەرکەوتن و بەزینەوە: تەنها جووڵە بوونی هەیە.

زستان لەپێناو بوون بە دەسەڵاتتریندا تێدەکۆشێت، بەڵام لەکۆتاییدا، ناچارە ئەو سەرکەوتنەی بەهار قبوڵ بکات، کە گوڵ و شادمانی لەگەڵ خۆی هێناوە.

هاوین حەزدەکات ڕۆژە گەرمەکانی بۆ هەتاهەتایە بەردەوام بن، چونکە لەو بڕوایەدایە گەرمی بۆ زەوی بەسوود بێت، بەڵام لەکۆتاییدا، دەبێت گەیشتنی پاییز قبوڵ بکات، کە دەبێتە هۆی حەواندنەوەی زەوی.

ئاسک گیا دەخوات و خۆیشی دەبێتە خۆراکی شێر. ئەمە بابەتی ئەوە نییە کێ بەهێزترە، بەڵکو ڕێگەی خودایە لە پیشاندانی خولی مردن و زیندووبوونەوەدا.

لەناو ئەو خولەشدا نە براوە و نە دۆڕاوە بوونی نییە، بەڵکو چەند قۆناغێك هەیە، کە دەبێت تێبپەڕێندرێن. کاتێك دڵی مرۆڤ لەمە تێدەگات، ئازاد دەبێ و کاتی تەنگوچەڵەمە قبوڵ دەکات و بە ساتە شکۆمەندانەکان هەڵناخەڵەتێت.

هەردووکیان تێدەپەڕن. یەکیان بەسەر ئەوەی تریاندا سەردەکەوێت. خولەکەش بەردەوام دەبێت هەتا خۆمان لە لاشە ئازاد دەکەین و وزەی پیرۆز دەدۆزینەوە.

لەبەر ئەوە، کاتێك شەڕکەر لە مەیدانی ململانێدا بوو -ئەگەر خواستی خۆی، یان چارەنووسی چاوەڕواننەکراو بەرەو ئەوێ پەلکێشی کردبێت- با لە سەرکەوتنی جەنگەکەی بەردەمییدا ڕۆحی پڕ لە شادی بکات. ئەگەر لەسەر شانازی و شکۆداری خۆی بەردەوام بێت، گەر تەنانەت شەڕەکەش بدۆڕێنێت، هەرگیز نابەزێت، چونکە ڕۆحی بە ساغی دەمێنێتەوە.

سەرزەنشتی کەسیش ناکات بۆ ئەوەی کە بەسەریدا ڕوودەدات. لەو ساتەوەی بۆ یەکەم جار عاشق دەبێت و ڕەتدەکرێتەوە، دەزانێت کە ئەمە توانای خۆشەویستی لەبەر نابڕێت. ئەوەی لە خۆشەویستییدا ڕاستە لە جەنگیشدا ڕاستە.

دۆڕاندنی شەڕ، یان دۆڕاندنی تەواوی ئەو شتانەی هەمانە لە ساتی غەمباری نزیکمان دەکاتەوە، بەڵام کاتێك ئەو ساتانە تێدەپەڕن ئازایەتییەکی شاراوە لەخۆماندا دەدۆزینەوە، ئازایەتییەك کە هەر یەکێك لە ئێمە سەرسام دەکات و ڕێزی خودییمان زیاد دەکات.

تەماشای چواردەوری خۆمان دەکەین و بە خۆمان دەڵێین: "هەستامەوە". وشەکانیشمان شادمانییمان پێ دەبەخشن.

تەنها ئەوانەی ئەو هێزە شاراوەیەی ناخیان نادۆزنەوە دەڵێن "دۆڕام" و غەمبار دەبن.

ئەوانەی تر، ئەگەر چی ئازاری بەزانیان هەیە و ئەو قسانە لەکەداریان دەکات، کە براوەکان پێیان دەڵێن، ڕێگە بە خۆیان دەدەن هەندێك فرمێسك بڕێژن، بەڵام هەرگیز خۆیان بۆ بەزەیی خۆیی بەدەستەوە نادەن. ئەوان دەزانن، کە ئەمە تەنها وەستانێکی شەڕەکەیە و لەو ساتەدا زیانیان پێ گەیشتووە.

گوێ لە لێدانی دڵی خۆیان دەگرن. ئەوان ئاگاداری پەشێوی و ترسەکەی خۆیانن. لە ژیانی خۆیان ڕادەمێنن و بۆیان دەردەکەوێت، سەرەڕای ترسەکەیان، هێشتا باوەڕیان پتەوە و ڕۆحیان بەرەو پێشەوەیان دەبات.

هەوڵ دەدەن بیدۆزنەوە چی هەڵە و چی ڕاستییان کردووە. ئەم ساتی بەزینە دەقۆزنەوە و سوودی حەوانەوە، چاککرنەوەی برینەکانیان و داهێنانی ستراتیژی نوێی لێ وەردەگرن و خۆیان باشتر دەکەن.

ئەوجا خۆری ئەو ڕۆژە هەڵدێت، کە جەنگێکی نوێ لە دەرگاکانیان دەدات. هێشتا دەترسن، بەڵام دەبێت کردار بکەن — یان ئەوە، یان دەبێت بۆ هەمیشەیی بە کەوتوویی لەسەر زەوییەکە بمێننەوە. هەڵدەستن و ڕووبەڕووی ڕکابەرەکانیان دەبنەوە، ئەو ئازارەیان بەبیر دەکەوێتەوە کە چەشتوویانە و ئیدی نایانەوێت بیچێژن.

بەزینی پێشوویان واتای ئەوەیە، کە ئەمجارە دەبێت بیبەنەوە، چونکە نایانەوێت دووبارە هەمان ئازار بچێژنەوە.

بەڵام ئەگەر ئەمجارە سەرکەوتن بۆ ئەوان نەبوو، ئەوا جاری داهاتوو بۆ ئەوان دەبێت. ئەگەر جاری داهاتووش نەبوو، ئەوا جاری دوای ئەو دەبێت. شتە گرنگەکە ئەوەیە، کە لەسەر پێکانت دووبارە ڕاوەستیتەوە.

تەنها ئەوەی کۆڵ دەدات دەبەزێت. هەموو ئەوانەی دیکە براوەن.

ئەوجا ئەو ڕۆژە دێت کە تەواوی ئەو ساتی تەنگوچەڵەمانە بە تەنها چیرۆکێکن، کە دەبێت بەشانازییەوە بگێڕدرێنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە گوێ ڕادەدێرن، ئەوانیش بەڕێزەوە گوێ دەگرن و سێ شتی گرنگ فێردەبن:

بەئارامی چاوەڕوانی ساتی گونجاو بکە بۆ دەست بەکار بوون.

شانازی بە جێ برینەکانتەوە بکە.

برین مەدالیایە بەسەر لاشەوە، دوژمنەکانیشت لێیان دەترسن، چونکە ئەو برینانە بەڵگەی ئەزموونی درێژخایەنی جەنگن. زۆرینەی کات ئەمە وایان لێ دەکات هەوڵی گفتوگۆ بدەن و خۆیان لە پێکدادان بپارێزن.

برین زۆر لەو شمێشرە بڵندتر دەدوێت، کە هەڵیکۆڵیووە.

کاتێک بازرگانێک بۆی دەرکەوت
قبتییەکە لە قسەکردن تەواو بووە،
گوتی، "باسی کەسە بەزیوەکان بکە".

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

بەزیوەکان ئەوانەن، کە هەرگیز ناکەون.

بەزین بەو واتایە دێت، کە ئێمە جەنگێك، یان شەڕێکی تایبەتی دەدۆڕێنین. سەرنەکەوتن ڕێگەی ئەوەمان پێ نادات لەسەر شەڕکردن بەردەوام بین.

بەزین ئەوکاتەیە، کە لە دەستکەوتنی شتێکدا، کە زۆر ئارەزووی دەکەین سەرکەوتوو نابین. سەرنەکەوتن ڕێگەی خەونبینینمان لێ دەگرێت. نەشیدەکەی ئەمەیە: "چاوەڕێی هیچ شتێك مەکە تا هیوابڕاو نەبیت".

بەزین ئەوکاتە کۆتایی پێ دێت، کە دەست بە شەڕێکی تر دەکەین. سەرنەکەوتن کۆتایی نییە: هەڵبژاردەیەکی هەمیشەییە.

بەزین بۆ ئەو کەسانەیە، کە سەرەڕای ترسەکەیان، بە پەرۆشی و باوەڕەوە دەژین.

بەزین بۆ کەسی نەبەردە. تەنها ئەوان شکۆمەندی دۆڕان و شادی بردنەوە دەزانن.

من نەهاتووم پێت بڵێم بەزین بەشێکی ژیانە: ئێمە هەموومان ئەوە دەزانین. تەنها بەزیوەکان لە خۆشەویستی دەگەن. چونکە یەکەم جەنگمان لە شانشینی خۆشەویستییدا هەڵدەگیرسێنین – بەگشتیش دەدۆڕێین.

من هاتووم پێتبڵێم کەسانێك هەن، کە هەرگیز نەبەزیوون.

ئەوانیش ئەو کەسانەن، کە هەرگیز نەجەنگیوون.

ئەوان توانیویانە خۆیان لە برین و زەبوونی و هەستی بێ کەڵکی بەدوور بگرن، هەر وەك ئەو ساتانەی کە تەنانەت جەنگاوەرەکانیش گومان لە بوونی خودا دەکەن.

خەڵکی لەو شێوەیە بە شانازییەوە دەڵێن: "هەرگیز جەنگێکم نەدۆڕاندووە". بەشێوەیەك لە شێوەکان، هەرگیز ناتوانن بڵێن: "جەنگێکم بردۆتەوە".

ئەوان گوێی پێ نادەن. ئەوان لە گەردوونێکدا دەژین، کە باوەڕیان بە پتەوی و سەختی خۆیان هەیە؛ چاوەکانیان لە ئاست ناعەدالەتی و ئازار چەشتندا دادەخەن؛ هەست بە پارێزراوی دەکەن، چونکە پێویست ناکات مامەڵە لەگەڵ ئەو بەرەنگارییانەی ژیاندا بکەن، کە ئەو کەسانە ڕووبەڕوویان دەبنەوە، کە لە پشتی سنوورەکانیانەوە خۆیان دەخەنە مەترسییەوە.

ئەوان هەرگیز وشەگەلی "ماڵئاوا" یان "گەڕامەوە. بە هەستی گەرمی کەسێکەوە لەباوەشم بگرە، کە لەدەستی دابم و دووبارە دۆزیبیمیەوە". یان نەبیستووە.

ئەوانەی هەرگیز نەبەزیوون شادمان و بڵند دیارن، دەڵێی سەرۆکی ئەو بڕوایەن، کە هەرگیز پەنجەیەکیان بۆ بەدەستهێنانی ڕانەکێشاوە. ئەوان

هەمیشە لە تا بەهێزەکەدان. ئەوان لە کەمتیار دەچن، کە لەسەر پاشماوەی شێرەکان دەژین.

ئاوها منداڵەکانیان فێردەکەن: "خۆتان لەقەرەی بەرەنگاری مەدەن، تەنها دۆڕانتان بۆ دەمێنێتەوە. گومانەکانتان بۆ خۆتان هەڵبگرن، بەو شێوەیەش هەرگیز ڕووبەڕووی هیچ کێشەیەک نابنەوە. ئەگەر کەسێک لێی دان، خۆتان بە لێدانەوەی بێ هەمێت و تاوانبار مەکەن. شتی گرنگتر لە ژیاندا بوونی هەیە".

لە بێ دەنگی شەودا، جەنگە ئەندێشەییەکانیان دەکەن: خەونە نەژاندراوەکانیان، ئەو نادادپەروەرییەی چاویان لەئاستیدا داخستووە، ئەو ساتە ترسنۆکانەی توانیویانە لە خەڵکی بشارنەوە –بەڵام نەیانتوانیوە لە خۆیانی بشارنەوە– و ئەو خۆشەویستییەی کە بە چاوێکی درەوشاوەوە بە ڕاڕەوەکانیاندا تێپەڕیووە، ئەو خۆشەویستییەی خودا بۆیانی تەرخان کردووە، بەڵام کەمی ئازایەتی وایان لێ دەکات نەتوانن لەباوەشی بگرن.

بەڵێنیش بەخۆیان دەدەن: "سبەی جیاواز دەبێت".

بەڵام سبەی دێت و پرسیارە ئیفلیجکەرەکە لە مێشکیاندا دەورووژێت: "ئەی چی دەبێت ئەگەر بەکاری خۆی نەیەت؟"

ئەوجاش هیچ شتێک ناکەن.

خەفەت بۆ ئەو کەسانەی هەرگیز نەکەوتوون! هەرگیز لەم ژیانەدا براوە نابن.

ژنێکی لاو، کە خەریکبوو هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕی یەکێک لە دەوڵەمەندترین پیاوەکانی شارەکەدا دەکرد، بەڵام ئێستا دەیویست هەڵبێت، گوتی، "باسی تەنیاییمان بۆ بکە".

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

بەبێ بوونی تەنیایی، خۆشەویستی زۆر لەگەڵتدا نامێنێتەوە.

چونکە خۆشەویستی پێویستی بە حەوانەوە هەیە، بەو شێوەیەش دەتوانێت بە ئاسمانەکاندا گەشت بکات و خۆی لە فۆڕمی تردا ئاشکرا بکات.

بەبێ تەنیایی، هیچ ڕووەك و ئاژەڵێك ناژێنەوە، هیچ خاکێك بە بەپیتی نامێنێتەوە، هیچ منداڵێك لەبارەی ژیانەوە فێر نابێت، هیچ هونەرمەندێك بەرهەمی نابێت، هیچ کارێك گەشە ناکات و ناگۆڕێت.

تەنیایی نادیاریی خۆشەویستی نییە، بەڵکو تەواوکەریەتی.

تەنیایی بزریی هاوەڵ نییە، بەڵکو ئەو ساتەیە، کە ڕۆحمان ئازادی ئەوەی هەیە قسەمان لەگەڵدا بکات و یارمەتیمان دەدات بڕیاری ئەوە بدەین چی لە ژیانمان بکەین.

لەبەر ئەوە، پیرۆزکراو ئەوانەن، کە لە تەنیایی ناترسن، ئەوانەی لە هاوەڵی خۆیان ناترسن، ئەوانەن کە هەمیشە بە نائومێدی چاو بۆ کردنی شتێك ناگێڕن، شتێك تا دڵی خۆیانی پێ بدەنەوە، شتێك کە هەڵیبسەنگێنن.

ئەگەر هەرگیز بەتەنیا نەبیت، خۆت ناناسیت.

ئەگەر خۆشت نەناسیت، لە بەتاڵی دەترسیت.

بەڵام بەتاڵی بوونی نییە. جیهانێکی فراوان لە ڕۆحماندا حەشاردراوە، چاوەڕێیە بدۆزرێتەوە. ئەوەتا، بە تەواوی هێزییەوە، بەڵام هێندە بەهێز و نوێیە، کە لە دانپیانانی بوونی دەترسین.

کرداری بیرکردنەوەی ئێمە کێین زۆرمان لێ دەکات ئەوە قبوڵ بکەین، کە دەتوانین لەوە زیاتر بڕۆین، کە خۆمان بیری لێ دەکەینەوە. ئەوەش دەمانترسێنێت. باشترین شت ئەوەیە خۆت لە مەترسییەکە دوور بخەیتەوە. هەمیشە دەتوانین بڵێین: "ئەوەم نەکرد، کە دەبوو بیکەم، چونکە ڕێگەیان نەدەدام".

ئەوە ئاسوودەبەخشترە. پارێزراوترە. لە هەمان کاتیشدا، هاوتای دەستبەرداربوونی ژیانی خۆتە.

وەی بۆ ئەو کەسانەی پێیان باشە بڵێن: "هەرگیز هیچ هەلێکم بۆ هەڵنەکەوتووە".

چونکە لەگەڵ تێپەڕینی هیچ ڕۆژێکدا، قوڵتر لە بیری سنوورەکانیاندا نوقوم دەبن، ئەوجا ئەو ساتە دێت، کە غیرەتی ئەوەیان نییە بە دیواری بیرەکەدا هەڵبزنێن و بێنە دەرەوە تا ئەو ڕووناکییە بدۆزنەوە، کە لە کونەکەی سەرو سەریانەوە دەدرەوشێتەوە.

بەڵام پیرۆزکراو ئەوانەن، کە دەڵێن: "زۆر ئازا نیم".

چونکە دەزانن ئەوە هەڵەی کەسێکی دیکە نییە. ئەوجاش زوو یان درەنگ، بڕوای پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەنیایی و نهێنییەکانی دەدۆزنەوە.

***

ئەو کەسانەی کە لەو تەنیاییە ناترسن، کە هەموو شتێك ئاشکرا دەکات، تامی هەموو شتەکان بۆیان جیاوازە.

لە تەنیاییدا، ئەوان ئەو خۆشەویستییە دەدۆزنەوە، کە ڕەنگبوو بەبێ ئاگاداری بگەیشتبایە. لە تەنیاییدا، ئەوان لەو خۆشەویستییە تێدەگەن و ڕێزی دەگرن، کە بەجێی هێشتوون.

لە تەنیاییدا، ئەوان دەتوانن بڕیاری ئەوە بدەن، کە ئەو خۆشەویستییە لەدەستچووە نرخی گەڕانەوەی هەیە، یان دەبێت بە سادەیی ڕێگەی ڕۆیشتنی بدەن و ڕاڕەوێکی نوێ بگرنە بەر.

لە تەنیاییدا، ئەوان بۆیان دەردەکەوێت، کە گوتنی "نەخێر" هەمیشە واتای پیشاندانی کەمی بەخشندەیی نییە و گوتنی "بەڵێ"ش هەمیشە چاکەکاری نییە.

ئەوانەش کە لەم ساتەدا بە تەنیان هەرگیز پێویست ناکات لە وشەگەلی خراپەکاری بترسێن: "تۆ کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت".

یان بە وشەگەلی بەهێزی سەرۆکی خراپەکارییەکان: "کەس گوێ بە تۆ نادات".

وزەی پیرۆز گوێمان بۆ ڕادەدێرێت کاتێك لەگەڵ خەڵکانی تر قسە دەکەین، تەنانەت ئەو کاتانەش گوێ دەگرێت، کە هێمن و بێ دەنگین و دەتوانین تەنیایی وەك پیرۆزییەك قبوڵ بکەین.

لـەو ساتەشـدا، شـەوقەکەی هـەموو شـتێکی چـواردەورمان ڕووناک دەکاتەوە و یارمەتیمان دەدات ئەوە ببینین کە ئێمە پێویستین، بوونیشمان لەسەر زەوی جیاوازییەکی گەورە بۆ کاری ئەو دروست دەکات.

کاتێکیش ئەو هاوسەنگییە بە دەست دەهێنین، لەوە زیاتر وەردەگرین، کە داوای دەکەین.

***

بۆ ئەو کەسانەی کە هەست بە ستەمی تەنیایی دەکەن، گرنگە لە یادتان بێت، کە لە هەرە ساتە گرنگەکانی ژیاندا ئێمە تەنیاین.

ئەو کاتـەی منـداڵ لـە منداڵـدانی ژن دەردەهێنـدرێت: گـرنگ نییـە چـەند کەسان ئامادەن، بڕیاری کۆتایی ژیان پەیوەندی تەنیا بە منداڵەکەوە هەیە.

هێنانی هونەرمەند و کارەکـەی: بـۆ زۆر باشـبوونی کارەکـەی، پێویسـتی بەوەیە هێمن بێت و تەنها زمانی فریشتە ببیستێت.

هێنانی هەموومان، کاتێک ڕووبەڕووی میوانە نەخوازراوەکە دەبینەوە، کـە مەرگە: هەموومان لەو ساتە گرنگ و تۆقێنەرەی بوونماندا بە تەنیا دەبین.

هەر وەک چۆن خۆشەویستی مەرجی پیرۆزە، تـەنیاییش مـەرجی مرۆڤـە. ئەوانەی کە لە پەرجووی ژیـان تێدەگـەن، لـە هـەمان کاتـدا هـەردوو تامەکـە پێکەوە دەکەن.

کوڕێکیش، کە یەکێك بوو لەوانەی بۆ
ڕۆیشتن هەڵبژێردرابوو، جلەکانی خۆی
گرت و گوتی:

"شارەکەم لەو باوەڕەدان بە کەڵکی شەڕکردن
نەیەم. من بێ سوودم".

لەوەڵامدا گوتی:

***

هەندێك خەڵك دەڵێن: "کەس خۆشی ناوێم". بەڵام بۆ ئەو خۆشەویستییە نەویستراوەش، هەمیشە هیوا هەیە، کە ڕۆژێك دێت دەویسترێت.

هەندێکی تر لە یادنامەکەیاندا دەنووسن: "بلیمەتییەکەم دەرکی پێ ناکرێت، بەهرەکەم نانرخێندرێت، خەونەکانم بە سووك سەیر دەکرێن". بەڵام بۆ ئەوانیش هیوا هەیە، کە لەپاش ململانێیەکی زۆر، شتەکان دەگۆڕێن.

هەندێك خەڵکی تر ڕۆژەکانیان بە لەدەرگادانەوە بەسەردەبەن و دەڵێن: "من بەدووی کاردا دەگەڕێم". دەزانن، ئەگەر ئارام بگرن، یەکێك بانگهێشتیان دەکاتە ژووری.

***

بەڵام هەندێکیش هەن، کە بەیانیان بە دڵێکی قورسەوە بەئاگا دێنەوە. ئەوان بەدووی خۆشەویستی و دان پیانان و کاردا ناگەڕێن.

ئەوان بە خۆیان دەڵێن: "من بێ سوودم. من لەبەر ئەوە دەژیم، کە هەستمەوە، بەڵام هیچ کەس، بەتەواوەتی هیچ کەسێك، بایەخ بەوە نادات، کە دەیکەم".

لەدەرەوە، خۆرەکە دەدرەوشێتەوە، ئەوان خێزانەکەیان لەدەورە و هەوڵ دەدەن درێژە بە پۆشینی دەمامکی شادمانی بدەن، چونکە لە چاوی ئەوانەی تردا، ئەمان هەموو ئەو شتانەیان هەیە، کە لە ژیانیاندا خەونیان پێیانەوە بینیووە. بەڵام قایلن بەوەی کە هیچ کەسێك پێویستی بەوان نییە، یان لەبەر ئەوەی کە زۆر لاون و وا دەردەکەوێت بەتەمەنەکان سەرقاڵی شتی تر بن، یان لەبەر ئەوەی زۆر پیرن و ئەندامە لاوەکانی خێزانەکە بایەخ بەو شتانە نادەن، کە ئەمان دەیڵێن.

شاعیر چەند دێرێك دەنووسێت و وەلایان دەنێت، بیر دەکاتەوە: "کەس بایەخ بەمە نادات".

کرێکار دەگاتە سەر کار و هەر هەمان ئەو کارە دووبارە دەکاتەوە، کە دوێنێ کردوویەتی. لەو باوەڕەدایە، ئەگەر هەر کاتێك دەربکرێت، هیچ کەس بایەخ بە نائامادەیی نادات.

ژنێکی گەنج عەزییەك دروست دەکات و ئازاری پێوە دەچێژێت، کاتێکیش بۆ بۆنەیەك دەیپۆشێت، پەیامی چاوانی خەڵکانی تر دەخوێنێتەوە: "تۆ نە لە کچەکانی تر جوانتری، نە ناشرینتریشیت. عەزیەکەشت یەکێکە لەو ملیۆنان عەزییەی جیهان، کە لەم ساتەدا، لە بۆنەی دیکەدا لەبەرکراون — هەندێك لە کۆشکی گەورە، هەندێکی تر لە گوندی بچوك، کە هەمووان تێیدا یەکتر دەناسن و لێدوان لەسەر جل و بەرگی

یەکتری دەدەن. بەڵام کەس لێدوانی لەسەر ئەوە نەدا، کە ئەو لەبەری کردووە و تێبینی نەکراوە. نە جوان بووە و نە ناشرین؛ تەنها عەزییەکی دیکەی ئاسایی بووە.

بێ سوود.

لاوەکان پێیان وایە جیهان پڕیەتی لە کێشەی گەورە، کە ئەوان خەون بە چارەسەرکردنیانەوە دەبینن، بەڵام کەس بایەخ بە باری ڕوانینیان نادات. پێیان دەگوترێت، "تۆ بەتەواوەتی نازانیت جیهان چۆنە. گوێ لە بەتەمەنەکان بگرە و ئەوکاتە فیکرەیەکی باشترت بۆ کردەوەکانت دەبێت".

خەڵکە بەتەمەنەکان کامڵ بوون و ئەزموونیان وەرگرتووە، بە شێوەیەکی زەحمەت فێری تەنگوچەڵەمەکان بوون، بەڵام کاتێك وەختی ئەوەیان دێت ئەو شتانە فێری خەڵکی بکەن، کەس بایەخیان پێ نادات. پێیان دەگوترێت، "جیهان گۆڕاوە. دەبێت لەسەر مۆدە بڕۆیت و گوێ لە لاوەکان بگریت".

هەستی بێ سوود ڕێزگری تەمەن نییە و هەرگیز داوای ڕێدان ناکات، بەڵکو لەجێی ئەوە ڕۆحی خەڵکی دادەخورێنێت، دووبارە و دووبارەی دەکاتەوە: "کەس بایەخت پێ نادات، تۆ هیچ نیت، جیهان پێویستی بە تۆ نییە".

لە هەوڵێکی نائومێدانەدا بۆ بەخشینی مانا بە ژیان، زۆر کەس ڕوو لە ئایین دەکەن، چونکە ململانێ بەناوی باوەڕێکەوە هەمیشە پاساوە بۆ هەندێك کاری مەزن، کە دەتوانن جیهان بگۆڕن. بە خۆیان دەڵێن، "ئێمە کاری خودا ئەنجام دەدەین".

ئـــەوجا دەبنـــە شـــوێنکەوتوویەکی لـــەخوداترس، پاشـــان ئینجیلـــی، لەکۆتاییشدا، بە مەزن.

تێناگەن ئایین بۆ بەشکردنی نهێنییەکان و پەرستن خولقێندراوە، نەك بۆ کپکردن و گۆڕینی خەڵکانی تر. مەزنترن پەرجووی خودا ژیانە. ئای قودس، ئەمشەو بۆ تۆ دەگریم، چونکە تێگەیشتنی یەکێتیی پیرۆز لە هەزار ساڵی داهاتوودا ون دەبێت.

***

پرسیار لە گوڵی کێڵگەیەك بکە: "ئایا هەست بە بەسوودی دەکەیت؟ لە پاش هەموو شتێکیش، تۆ هیچ ناکەیت، تەنها دووبارە و دووبارە هەر هەمان گوڵ بەرهەم دەهێنیت".

گوڵەکەش لەوەڵامدا دەڵێت: "من جوانم، جوانیش هۆکاری ژیانمە".

پرسیار لە ڕووبار بکە: "ئایا سەرەڕای ئەوەی کە جگە لە لێژکردنەوەی ئاو هەر بە هەمان ئاڕاستەدا، هەست بە بەسوودی دەکەیت؟"

ڕووبارەکەش لەوەڵامدا دەڵێت: "من هەوڵ نادەم سوودبەخش بم. من هەوڵ دەدەم ڕووبار بم".

لە چاوی خودادا هیچ شتێکی ئەم جیهانە بێ سوود نییە. نە یەك گەڵای درەخت، نە یەك تاڵی قژت دەوەرێت، نە یەك مێرووش لەبەر بێ سوودی دەمرێت. هەموو شتێك هۆکارێك بۆ بوونی هەیە.

تەنانەت تۆش، کەسەکە پرسیارەکە دەکات. "من بێ سوودم" ئەو وەڵامەیە، کە خۆت بە خۆتی دەدەیت.

هەر زوو ئەو وەڵامە ژەهراویت دەکات و دەتکوژێت، تەنانەت لەکاتێکدا، کە لەژیانیشدایت، تەنانەت لە کاتێکدا، کە دەشرۆیت، دەخۆیت، دەخەویت و هەوڵ دەدەیت هەر کات شیاو بوو کەمێك گاڵتە بکەیت.

هەوڵ مەدە بەسوود بیت. هەوڵ بدە خۆت بیت: ئەوە بەسە و، هەر ئەوەش تەواوی جیاوازییەکە دەخوڵقێنێت.

نە لە ڕۆحت خاوتر و نە خێراتر برۆ، چونکە ئەوە ڕۆحتە، کە بە سوودی هەر هەنگاوێکت فێر دەکات. هەندێك جار بەشداریکردن لە جەنگێکی مەزندا دەبێتە ئەو شتەی یارمەتی گۆڕینی خولی مێژوو دەدات. بەڵام هەندێك جار زۆر بە سادەیی دەتوانیت ئەوە بە خەندەیەك بکەیت، لەبەر هیچ هۆکارێك، بەڕووی کەسێکدا، کە لە سەر شەقامەکە بەتەنیشتیدا تێدەپەڕیت.

بەبێ ئەوەی ئاگات لێ بێت، ڕەنگە ژیانی بێگانەیەکت ڕزگار کردبێت، کە ئەویش پێی وابووە بێ سوودە و ئامادەی خۆ کوشتن بووە — هەتا ئەو کاتەی خەندەیەك هیوا و باوەڕێکی نوێی پێ بەخشیووە.

***

ئەگەر ژیانی خۆت بە هەموو زانیارییەکانەوە بخوێنیت و لە هەموو ئەو ساتانەدا بژێیتەوە، کە ئازارت چەشتووە، عارەقەت کردۆتەوە و خەندەت کردووە لەژێر خۆردا، هێشتاش ناتوانیت بەتەواوەتی بزانیت بۆ چ کەسێك سوودبەخش بوویت.

هەرگیز ژیان بێ سوود نییە. هەر ڕۆحێك، کە دێتە خوارێ بۆ سەر زەوی هۆکارێکی هەیە.

ئەوانەی یارمەتی کەسانی تر دەدەن هەوڵ نادەن سوودبەخش بن، بەڵکو زۆر بەسادەیی ژیانێکی بەسوود دەگوزەرێنن. بە دەگمەن ئامۆژگاری دەبەخشن، بەڵام وەك نموونەیەك خزمەت دەکەن.

یەك شت بکە: ئەو ژیانە بژی کە هەمیشە ئارەزوویت کردووە. خۆت لە رەخنەگرتن لە کەسانی تر بە دوور بگرە و لە بەدیهێنانی خەونەکانتدا چڕ ببەرەوە. ڕەنگە ئەمە بۆ تۆ زۆر گرنگ دەرنەکەوێت، بەڵام خودا، ئەو زاتەی کە هەموو شتێك دەبینێت، بەو نموونەیە دەزانێت، کە دەیبەخشیت و یارمەتیدەری دەبێت لە پێشخستنی جیهاندا. هەر ڕۆژێکیش، زیاتر پیرۆزت دەکات.

***

کاتێکیش میوانە نەخوازراوەکە دەگات، گوێت لێیەتی دەڵێت:

"گونجاوە بپرسم: "باوکە، باوکە، بۆچی بەجێتهێشتم؟" بەڵام ئێستا، لەم دوایین چرکەیەی ژیانی سەر زەویتدا، پێت دەڵێم چیم بینی: بینیم خانووەکە پاك بوو، مێزەکە داندرابوو، زەوییەکان کێڵدرابوون، گوڵەکان دەخەنین. هەر شتێکم لە شوێنی لەباری خۆیدا دەبینی، لە شوێنێکدا کە رێك دەبوو لەوێدا بن. تێدەگەیت، کە شتە بچووکەکان لە گۆڕانکارییە گەورەکان بەرپرسن. لەبەر ئەو هۆکارەش، لەگەڵ خۆمدا دەتبەم بۆ بەهەشت".

ئەوجا ژنێکی بەرگدروو، کە ناوی
ئەلمیرا بوو، گوتی:

"دەکرا بەر لە گەیشتنی خاچپەرستەکان
بڕۆم، ئەگەر ئەوەشم بکردبا، ئێستا لە
میسر کارم دەکرد، بەڵام هەمیشە زۆر
لە گۆڕانکاری ترساوم".

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

ئێمە لە گۆڕان دەترسین، چونکە پێمانوایە لە پاش ڕەنج و قوربانییەکی زۆر، لە جیهانی ئێستەمان شارەزاین.

ئەگەر چی ڕەنگە ئەم جیهانە باشترینی جیهانەکانیش نەبێت، ئەگەر چی ڕەنگە بە تەواوەتیش پێی قایل نەبین، لانی کەم نامانخاتە هیچ سەرسامبوونێکی خراپەوە. بە هەڵەدا ناڕۆین.

هەر کات پێویست بوو، هەندێك ڕێکخستنەوەی مامناوەند دەکەین تا هەموو شتەکان بەشێوەی خۆیان بەردەوام بن.

ئێمە دەبینین چیاکان هەمیشە لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە. دەبینین زۆرینەی کات، کە داری تەواو گەشەکردوو دەگوێزرێنەوە، دەمرن.

ئێمەش دەڵێین: "دەمانەوێت بە شێوەی چیا و دارەکان بین. جێگیر و مایەی ڕێز". ئەگەر چی لە میانی شەودا بەئاگا دێین و بیر دەکەینەوە: "خۆزگە وەك ئەو باڵندانە دەبووین، کە دەتوانن سەردانی دیمەشق و بەغداد بکەن، هەر کاتیش بیانەوێت دەگەڕێنەوە".

یان: "خۆزگە بەشێوەی با دەبووم، کەس نازانێت لە کوێوە هەڵدەکات و بەرەو کوێ دەچێت، هەرکاتێکیش بیەوێت دەتوانێت بەبێ ڕوونکردنەوەی ئاڕاستەی خۆی بگۆڕێت".

بەهەرحاڵ، بۆ ڕۆژی دواتر، بیرمان دەکەوێتەوە، کە هەمیشە باڵندەکان لە دەست ڕاوکەر، یان باڵندەی گەورەتر هەڵدێن؛ هەندێك جاریش با کە لە گێژاوی گەردەلوولدا گیردەخوات و هەموو شتەکانی چواردەوری وێران دەکات.

خەونێکی جوانە، کە هەمیشە لە داهاتوودا کاتی گەشتکردنمان هەیە، بەو شێوەیەش، ڕۆژێك دێت گەشت بکەین. ئەوە شادمانت دەکات چونکە دەزانین لەوە زیاترمان پێ دەکرێت، کە ئەنجامی دەدەین. خەون مەترسی لەخۆ ناگرێت. شتە مەترسیدارەکە ئەوەیە هەوڵ بدەیت خەونەکەت بکەیتە واقع.

بەڵام ئەو ڕۆژە دێت، کە چارەنووس لە دەرگاکانمان دەدات. ڕەنگە ئەوەش سووکە لێدانی فریشتەی بەختی باش بێت، یان بە بێ هەڵە ڕووبەڕووبوونەوە بێت لەگەڵ میوانە نەخوازراوەکەدا. هەردوو دەڵێن: "ئێستا بگۆڕێ!" هەفتەی داهاتوو و مانگی داهاتوو و ساڵی داهاتوو نا. فریشتەکان دەڵێن: "ئێستا!"

ئێمە هەمیشە گوێ بۆ میوانە نەخوازراوەکە دەگرین. هەموو شتێکیش دەگۆڕین، چونکە دەمانترسێنێت: گوند و خو و پێڵاو و خواردن و ڕەفتار دەگۆڕین. ناتوانین میوانە نەخوازراوەکە قایل بکەین بەوەی وەك خۆمان بمێنینەوە. هیچ گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەودا بوونی نییە.

گوێ لە فریشتەی بەختی باشیش دەگرین، بەڵام دەپرسین: "ئایا ئەمە بۆ کوێ دەچێت؟" لەوەڵامدا دەگوترێت، "بەرەو ژیانێکی نوێ".

ئێمەش لەبیری خۆماندا دەڵێین: "ئێمە چەند کێشەیەکی کەممان لە ژیانی خۆماندا هەیە، بەڵام هیچیان لە کاتی خۆیاندا چارەسەر ناکرێت. دەبێت ببینە نموونەیەك بۆ دایك و باوکمان، مامۆستاکانمان، منداڵەکانمان و، لەسەر ڕاڕەوی ڕاست بەردەوام بین. دراوسێکان چاوەڕێی ئەوەمان لێ دەکەن چاکەی بەردەوامی فێری هەموو کەسێك بکەین، کە ململانێ لەبەرامبەر بەڵادا بکەین و بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ بین.

ئێمەش شانازی بە خۆمانەوە دەکەین. پیاشماندا هەڵدەدرێت، چونکە گۆڕانمان ڕەتکردۆتەوە و لەجێی ئەوە بەرەو ئەو ئاڕاستەیە بەردەوامین، کە چارەنووس بۆی هەڵبژاردووین.

هەڵەیە.

ڕاڕەوی ڕاست ڕاڕەوی سروشتە، کە بەبەردەوامی دەگۆڕێت، هەر وەك گردەباکانی ناو بیابان.

ئەوانەی پێیانوایە چیاکان ناگۆڕێن هەڵەن: ئەوان لە زەمینلەرزەوە لەدایك دەبن و با و بارانیش دایاندەخورێنێت، ئەگەرچی ئێمە تێبینیشی ناکەین، بەڵام هەموو ڕۆژێك تۆزقاڵێك جیاوازییان تێدایە.

چیاکان دەگۆڕێن و شادمانن: بەیەکدی دەڵێن، "شتێکی باشە، کە تەواوی کاتەکان بە یەك شێوە نامێنینەوە".

ئەوانەی پێیانوایە دارەکان ناگۆڕێن هەڵەن. دەبێت ئەوە قبوڵ بکەن، کە لە زستاندا رووت و لە هاوینیشدا پۆشتەن. دەشگەنە پشتی ئەو سنوورانەی کە تێیاندا ڕوێندراون، چونکە با و باڵندەکان تۆوەکانیان دەپرژێنن.

دارەکان ئاسوودەن. بەو نەمامانەی لە دەوری خۆیان ڕواون دەڵێن، "پێموابوو تەنها یەك دار بم، بەڵام ئێستا دەبینم چەندین دانەم".

***

سروشت پێمان دەڵێت: "بگۆڕێ!"

ئەوانەش، کە لە فریشتەی بەختی باش ناترسێن، سەرەڕای ترسەکەشیان، دەبێت بەرەو پێش برۆن. سەرەڕای گومانەکانیان. سەرەڕای تاوانبارکردنیان. سەرەڕای ترساندنەکانیان.

ئەوان بەرەنگاری بەها و کینەی خۆیان دەبن. ئەوان گوێ بۆ ئامۆژگاری کەسە خۆشەویستەکانیان ڕادەدێرن، کە دەڵێن: "بۆ ئەوە دەکەیت؟ تۆ هەموو ئەوانەت هەیە، کە پێویستت پێیەتی: خۆشەویستی دایك و باوك و ژن و منداڵەکانت، ئەو پیشەیەی زۆری پێ چوو تا فێری بوویت. مەترسی بوون بە بێگانە لە زەوییەکی نامۆدا مەگرە ئەستۆ.

لەگەڵ ئەوەشدا، مەترسی یەکەم هەنگاو دەگرنە ئەستۆ -هەندێك جار لەبەر زانخوازی و هەندێکجاریش لەبەر پەرۆشی- بەڵام بەگشتی لەبەر ئەوەی کۆنترۆڵ نەکراوانە هەست بە ئارەزووی سەرکەشی دەکەن.

لە هەر لۆفەیەکی شەقامەکەدا، زیاتر و زیاتر دەترسن، هێشتاش لە هەمان کاتدا خۆیان سەرسام دەکەن: ئەوان ئازاتر و دڵخۆشترن.

شادی. ئەوە یەکێکە لە پیرۆزییە سەرەکییەکانی زاناترین. ئەگەر شادمان بین، لەسەر ڕێگەی ڕاستین.

وردە وردە ترس دەڕەوێتەوە، چونکە ئەوەی ترسەکەی لێ کەوتبۆوە گرنگیی نەبوو.

پرسیارێك بەردەوام دەبێت کاتێك یەکەم هەنگاو بە درێژە ڕێگەکەماندا دەنێین: "ئایا بڕیاری گۆڕانکاریم زیانی بۆ خەڵکانی تر هەیە؟"

بەڵام ئەگەر کەسێکت خۆش بوێت، حەزدەکەیت خۆشەویستەکەت دڵخۆش بێت. ڕەنگە یەکەمجار بترسیت، بەڵام هەر زوو ئەو ترسە دەبێتە شانازی کاتێك دەیبینیت ئەو شتە دەکات، کە هەمیشە ئارەزووی کردووە و بەو شوێنە گەیشتووە، کە هەمیشە خەونی پێوە بینیوە.

ڕەنگە دواتر ئەزموونی هەستێکی بەجێهێشتن و لاوازی بکەین.

بەڵام گەشتیارەکان لە ڕێگەکەیاندا چاویان بە گەشتیاری تر دەکەوێت، کە ئەوانیش هەر بەو شێوەیەن. کاتێك قسە دەکەن، بۆیان دەردەکەوێت، کە بە تەنیا نین؛ دەبنە هاوەڵی گەشتەکە و چەند چارەسەرێك بۆ کۆسپە جیاوازەکان بە یەکدی دەڵێن. ئەوجاش هەموویان هەست بە زیاتر ژیری و زیندوویتی دەکەن وەك لە پێشوویان.

کاتێك لە چادرەکەیاندا ڕادەکشێن، ناتوانن بخەون و غەم و پەشیمانی بەسەریاندا زاڵ دەبێت، بە خۆیان دەڵێن: "سبەی، هەر سبەی، هەنگاوێکی تر دەنێم. لەگەڵ ئەوەشدا، هەمیشە دەتوانم بگەڕێمەوە، چونکە ڕێگەکە شارەزام، بەڵام هەنگاوێکی تر جیاوازییەکی زۆر ناخوڵقێنێت".

***

هەتا ڕۆژێك دێت ڕێگەکە لە تاقیکردنەوەی گەشتیارەکە دەوەستێت و دەست دەکات بە مامەڵەی بەخشندانە لەگەڵیدا. ڕۆحی ماندووی گەشتیارەکە شادی لە جوانی و بەرەنگاری دیمەنە سروشتییە نوێکە وەردەگرێت.

ئەوجا هەر هەنگاوێك، کە هەتا ئەوکاتە خۆکارانە بووە، دەبێتە بەشێك لە ئاگایی.

لەجێی قسەکردن لەسەر شادمانی پارێزراوی، فێری دەکات ڕووبەڕووی ململانێی نوێ ببێتەوە.

گەشتیارەکە لەسەر گەشتەکەی بەردەوام دەبێت. ئێستا سکاڵای بێزاریی نییە؛ سکاڵا دەکات وەك لەوەی ماندوو ببێت. بەڵام لەو حاڵەتەدا، دەحەوێتەوە، کەیف لە دیمەنە سروشتییەکە وەردەگرێت و بەردەوام دەبێت.

لەجێی ئەوەی تەواوی ژیانی لەوەدا بەسەر بەرێت ئەو ڕێگەیانە وێران بکات، کە لێیان دەترسا پێیاندا بڕوات، خۆشەویستیی بۆ ئەو ڕێگەیە دەجووڵێت، کە ئێستا تێیدایە.

گەر تەنانەت شوێنی مەبەستی کۆتاییشی بە نهێنی بمێنێتەوە. ئەگەر بە شێوەیەك لە شێوەکان، بڕیارێکی هەڵەش بدات. خودا ئازایەتی ئەو دەبینێت و سروشتی پێویستی بۆ دەنێرێت تا کێشەکان چارەسەربن.

ئەوەی لەسەر بێزارکردنی بەردەوام دەبێت ئەوە نییە، کە ڕوودەدات، بەڵکو ترسێکە، کە نازانێت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

هەر کە بڕیاری دا بە دووی ڕاڕەوەکەی خۆی بکەوێت و جێگرەوەی بۆی نەبێت، بۆی دەردەکەوێت کە هێزێکی مەزنی هەیە و ڕووداوەکان لەسەر بڕیاری ئەو تێدەپەڕن.

"تەنگوچەڵەمە" ناوی کەرەستەیەکی دێرینە، کە بۆ یارمەتیدانی پێناسەکردنی ئێمە دروستکراوە.

ئایینەکان فێرمان دەکەن، کە بڕوا و گۆڕان تاکە ڕێگەن بۆ لە خودا نزیکبوونەوە.

بڕوا پیشانمان دەدات، کە هەرگیز بە تەنیا نین.

گۆڕان یارمەتیمان دەدات نهێنیەکەمان خۆش بوێت.

کاتێکیش هەموو شتەکان لێڵ دەرکەوتن و هەستمان بەتەنیایی و لاوازی کرد، بۆ ترسی بینینی گۆڕانکارییەکانی ناو ڕۆحمان ئاوڕ نادەینەوە. لە پێشی خۆمان دەڕوانین.

لەوە ناترسین، کە سبەی ڕوودەدات، چونکە دوێنێ هەندێك تەماشامان هەبوو.

هەمان حزوریش لەگەڵماندا دەمێنێتەوە.

ئامادەبوون دەبێتە پەناگەیەك بۆمان لە دژی ئازار چەشتن و هێزی ڕووبەڕووبوونەوەمان دەداتێ لەگەڵ شکۆمەندیدا.

لەوە زیاتر دەڕۆین، کە بیری لێ دەکەینەوە. ئێمە بۆ ئەو شوێنە دەگەڕێین، کە ئەستێرەی بەیانی لێ لەدایك دەبێت. کاتێکیش دەگەینە ئەوێ چەندە بەوە سەرسام دەبین، کە زۆر لەوە ئاسانتر بوو، کە وێنامان کردبوو.

***

میوانە نەخوازراوەکە سەردانی ئەوانە دەکات، کە دەگۆڕێن و ئەوانەش کە ناگۆڕێن. بەڵام ئەوانەی گۆڕاون دەتوانن بڵێن: "ژیانم پڕبایەخ بوو. پیرۆزییەکانم بەهەدەر نەدا".

بۆ ئەوانەش کە پێیانوایە سەرکەشی مەترسیدارە پێیان دەڵێم، ڕۆتین تاقی بکەنەوە: زۆر زووتر دەتانکوژێت.

کەسێکیش گوتی:

"کاتێك هەموو شتەکان ڕەش دەردەکەون، پێویستە ڕۆحمان بەرز بکەینەوە. کەواتە باسی جوانیمان بۆ بکە".

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

خەڵکی هەمیشە دەڵێن: "جوانی ناخ شەرتە، نەك جوانییەکانی تر".

بەڵام ئەوە ڕاست نییە.

ئەگەر ڕاست بایە، بۆچی گوڵ هێندە وزەیان لە سەرنج ڕاکێشانی هەنگدا بەکار دەخست؟ ئەی بۆچی دڵۆپی باران خۆیان دەگۆڕن بە پەلکەزێڕینە کاتێك چاویان بە خۆر دەکەوێت؟ چونکە سروشت جوانی هەڵدەسەنگێنێت و ئەو کاتە قایل دەبێت، کە جوانی دەربکەوێت. جوانی دەرەوە جوانی ناوەوە دەردەخات، خۆیشی لە شێوەی ڕووناکیدا دەردەخات و لە چاوانمانەوە ورووژم دەکاتە دەرێ. کێشە نییە ئەگەر کەسێك خراپ خۆی بپۆشێت، یان فیکرەی ڕێکپۆشی ئێمە بەسەر خۆیدا نەسەپێنێت، یان هەر گوێش بە سەرنج ڕاکێشانی خەڵکانی تر نەدات. چاوەکان ئاوێنەی ڕۆحن و هەموو ئەو شتانە پیشان دەدەن کە بەڕواڵەت شاراوەن؛ هەر وەکو ئاوێنە، پەرچی ئەو کەسەش دەداتەوە، کە تەماشایان دەکات. کەواتە ئەگەر کەسێکی ڕۆح تاریك تەماشای چاوی کەسێکی تر بکات، تەنها ناشرینییەکانی خۆی دەبینێت.

***

جوانی لە تەواوی مەخلوقەکاندا بوونی هەیە، بەڵام ڕاستییە مەترسیدارەکە ئەوەیە کە، چونکە ئێمەی مرۆڤ لە وزەی پیرۆز دادەبڕێین، ڕێگە بە خۆمان دەدەین قسەی خەڵکانی تر کارمان تێ بکات. نکۆڵی لە جوانی خۆمان دەکەین لەبەر ئەوەی خەڵکی دیکە ناتوانن بیبینن. لەجێی ئەوەی ببین بە خودی خۆمان، لاسایی شتەکانی دەوروپشتمان دەکەینەوە. ئێمە هەوڵ دەدەین ببینە ئەو شتەی کە خەڵکی بە "جوان" ناوی دەبەن، بەو شێوەیەش، وردە وردە ڕۆحمان دەپوکێتەوە، خواستمان لاواز دەبێت و هەموو ئەو شتە شاراوانەی ناخمان، کە دەمانویست جیهانێکی جوانتری پێ بخولقێنین، ون دەبن.

ئێمە لەبیری دەکەین جیهان ئەو شتەیە، کە خۆمان وێنای دەکەین بەو شێوەیە بێت.

ئێمە لە بوون بە هەیڤ دەوەستین و، لەجێی ئەوە، دەبینە ئەو زەلکاوەی کە هەیڤەکە شەوقی تێدا دەداتەوە. سبەی، خۆر ئاوەکەی ناوی دەکاتە هەڵم. هەمووشی لەبەر ئەوەی ڕۆژێک، کەسێک گوتوویەتی: "تۆ ناشرینیت". یان: "ئەو جوانە". تەنها بەو دوو وشە سادەیە، تەواوی بەرگری ناخمان دەدزن.

ئەوەش تاڵ و ناشرینمان دەکات.

***

لەو ساتەدا، دەتوانین ئاسوودەیی لەو شتە وەربگرین، کە پێی دەگوترێت "ژیری"، کۆکراوەیەکی فیکرەی خەڵکی کە خواستی پێناسەکردنی جیهانیانە لەجیاتی قبوڵکردنی نهێنی ژیان. ئەم "ژیرییە"

تـەواوی یاسـا و ڕێکـی و پێوانـە ناپێویسـتییەکانی دامەزرانـدنی ڕەفتـارێکی ستاندارد لە خۆ دەگرێت.

بەپێی ژیرییە هەڵەکە بێت، نابێت ئێمـە گـوێ بـە جـوانی بـدەین، چـونکە شتێکی ڕووکەش و ماوە کورتە.

ئەوە ڕاست نییە. هەموو ئەو زیندەوەرانەی لەژێر خۆردا ئافرێنـدراون، لـە باڵندەوە تا چیا، لە گوڵەوە هەتا ڕووبار، وێنەی پـەرجووی ئەفراندنن.

ئەگەر ڕێگە لە فریودانی ڕێگەدانی خەڵکی بۆ پێناسەکردنی ئێمـە بگـرین، ئەوا وردە وردە خۆرەکەی ناخمان دەدرەوشێتەوە.

خۆشەویسـتی دەگوزەرێـت و دەڵێـت: "هـەرگیز پێشـتر تێبینـیم نەکردوویت".

ڕۆحیشـمان لەوەڵامـدا دەڵێـت: "دە کەواتـە زیـاتر وریابـە، ئـەوەتا مـن لێرەم. کردنە دەرەوەی تـۆزی چـاوانت شـنەبایەکی گـەرەك بـوو، بـەڵام کـە ئێسـتا منـت بینیـووە، دیسـان لـێم دوور مەکـەوەرەوە، چـونکە هـەوومان خوازیاری جوانین".

جوانی لە چونیەکیدا نییە، بەڵکو لە جیاوازیدایە. کێ دەیتوانی وێنای زەڕافەیەك بەبێ ملە درێژەکەی یان سوبێرێك* بەبێ چقڵەکانی بکات؟ ناڕێکی لوتکەی چیاکانی دەوروپشتمان ئەو جوانییەی خوڵقاندووە. ئەگەر هەوڵمان بدابا هەموویان وەك یەك لێبکەین، ئیدی ئێمە ڕێزمان بۆیان دانەدەنا.

خەوشدارییە، کە سەرمان سوڕدەهێنێت و سەرنجمان ڕادەکێشێت.

---

* [illegible]

کاتێك تەماشای دار ئەرۆزێك دەکەین، لە بیری خۆماندا نالێین: "دەبوو هەموو لقەکان هەمان درێژیان هەبێت". بەڵکو دەڵێین: "چەندە بەهێزە".

کاتێك مارێك دەبینین، هەرگیز نالێین: "لەکاتێکدا من بەرێکی دەڕۆم، ئەو خۆی بە زەوییەکەدا دەخشێنێت". بەڵکو لەبیری خۆماندا دەڵێین: "ڕەنگە بچووك بێت، بەڵام پێستی پڕ ڕەنگە، جووڵەکانی ڕێکن و، زۆریش لە من بەهێزترە".

کاتێك وشتر لە بیابان دەپەڕێتەوە و ئێمە دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە دەمانەوێت بۆی بچین، هەرگیز نالێین: "ئەو کۆپارەی هەیە و ددانەکانی ناشرینن". بەڵکو لەبیری خۆماندا دەڵێین: "ئەو شایانی خۆشەویستی منە بۆ ئەو دڵسۆزی و یارمەتییەی. بەبێ ئەو هەرگیز نەمدەتوانی جیهان بگەڕێم".

خۆرئاوابوون زۆر جوانترە کاتێك بە هەندێك هەوری نارێك دەورەی دەدرێت، چونکە تەنها ئەو کاتە دەتوانێت پەرچی ئەو هەموو ڕەنگە بداتەوە کە خەون و شیعر سەرچاوەیان لێوە گرتووە.

بەزەیی بۆ ئەو کەسانەی لەبیری خۆیاندا دەڵێن: "من جوان نیم. هەر لەبەر ئەوەیە، کە خۆشەویستی لە دەرگای نەداوم". لەڕاستیدا خۆشەویستی لە دەرگای داوە، بەڵام کاتێك دەرگاکەیان لێ کردۆتەوە ئامادە نەبوون بانگهێشتی بکەنە ژووری.

یەکەمجار زۆر سەرقاڵی خۆ جوانکردن بوون، کە لەڕاستیدا هەر بەشێوەی ئێستە جوان بوون.

ئـــەوان هـــەوڵیان دەدا لاســـایی خـــەڵکانی تـــر بکەنـــەوە، لەکاتێکـــدا خۆشەویستی بۆ کەسێکی ڕەسەن دەگەڕا.

ئەوان هەوڵیان دەدا وێنەی ئەوە بدەنەوە، کە لە دەرەوە دێت، لـەبیریان کردبوو، کە ڕۆشنایی ڕاستەقینە لە ناخەوە سەرچاوە دەگرێت.

پیاوێکی گەنج کە دەبوو ئەو شەوە ئەوێ
بەجێ بهێڵێت، گوتی:

"هەرگیز دڵنیا نەبووم کام ئاڕاستە
بگرمە بەر".

لەوەڵامدا گوتی:

***

هەر بە شێوەی خۆر، ژیانیش تیشکەکانی بە هەموو ئاڕاستەیەکدا بڵاودەکاتەوە.

کاتێك لەدایك دەبین، حەزدەکەین هەموو شتەکانمان لە یەك کاتدا هەبێت و ناتوانین دەست بەسەر ئەو وزەیەدا بگرین، کە پێمان بەخشراوە.

مەزنترین نهێنیش، کە وزەی پیرۆز بۆ جیهانی ئاشکرا کرد ئاگر بوو. نەك هەر ئاگری سووتاندن، بەڵکو ئەو ئاگرەش، کە گەنم دەگۆڕێت بە نان.

ئەوجا ئەو ساتە دێت کە دەبێت سەرنج بخەینە سەر ئاگرەکەی ناخمان تا هەندێك واتا بە ژیانمان ببەخشین.

پاشان لە ئاسمانەکان دەپرسین: "بەڵام چ واتایەك؟"

هەندێك یەکسەر ئەم پرسیارە وەلا دەنێن: بێزارکەرە، ڕێگە نادات بخەویت و وەڵامی ئاسانیشی نییە. ئەوانەش ئەو کەسانەن، کە دواتر هەر بەشێوەی دوێنێ سبەی دەگوزەرێنن.

کاتێکیش میوانە نەخوازراوەکە دەگات، دەڵێن: "ژیانم زۆر کورت بوو، پیرۆزییەکانم بەهەدەر دا".

***

هەندێکی تر پرسیارەکە لە ئامێز دەگرن، بەڵام لەبەر ئەوەی وەڵامەکە نازانن، دەست بەخوێندنەوەی ئەو شتانە دەکەن، کە لەلایەن ئەو کەسانەوە نووسراوە، کە بەو ململانێیەدا تێپەڕیوون. ئەوجاش لەناکاو وەڵامێک دەدۆزنەوە، کە خۆیان بەڕاستی دەزانن.

کاتێک ئەوەش ڕوودەدات، ئەوان دەبنە کۆیلەی وەڵامەکە. دەست دەکەن بە دروستکردنی یاسا تا زۆر لە خەڵکی بکەن بەوە قایل بن، کە ئەوەی ئەوان بڕوایان پێی هەیە تاکە هۆکارێکە بۆ ژیان. پەرستگا بۆ هاوڕێکیی دروست دەکەن و دادگاش بۆ ئەوانەی ئەو شتە ڕەت دەکەنەوە، کە لای ئەوان ڕاستی بێ خەوشە.

***

لەکۆتاییشدا ئەو کەسانە هەن، کە پرسیارەکە وەک داو دەبینن: وەڵامی نییە.

لەجێی ئەوەی کات بەو داوەوە بەفیڕۆ بدەن، دەست بەکار دەبن. دەگەڕێنەوە بۆ ژیانی منداڵییان و چاو بۆ ئەوە دەگێڕن، کە پڕیکردوون لە پەرۆشی، ئەوجاش -بەبێ گوێدانە ئامۆژگاری بەتەمەنەکان- ژیانیان بۆ ئەوە تەرخان دەکەن.

چونکە پەرۆشی ئاگرە پیرۆزەکەیە.

بە هێواشی بۆیان دەردەکەوێت، کە کردارەکانیان بە هاندەرێکی نهێنییەوە بەستراوەتەوە، کە لە پشتی زانیاری مرۆڤەوەیە. وەک نیشانەی ڕێز سەریان بۆ نهێنییەکە دادەخەن و نزا دەکەن تا نەچنە سەر ڕاڕەوێك، کە لێی شارەزا نین، ئەوان ڕاڕەوێکیان هەڵبژاردووە، چونکە ئاگرەکە دڵیانی سووتاندووە.

هەر کات بتوانن ژیری بەکار دەهێنن و کاتێکیش بەو ژیرییە سەرکەوتوو نابن پەنا دەبەنە بەر هاوتایی.

تەواو شێتۆکە دیارن. هەندێك جاریش وەك خەڵکی شێت ڕەفتار دەکەن. بەڵام ئەوان شێت نین. ئەوان خۆشەویستی و ویستی ڕاستەقینەیان دۆزیوەتەوە.

ئەو دوو شتەش ئەو ئامانج و ئاڕاستەیە دەردەخەن، کە دەبێت شوێنی بکەویت.

ویستیان کریستاڵییە، خۆشەویستییان پاکە و هەنگاوەکانیان دیاریکراوە. لە ساتی گومان و غەمبارییدا هەرگیز لەیادی ناکەن: "من ئامێرێکم. ڕێگە بدە ببمە ئامێرێك توانای ئاشکراکردنی ویستەکەتی هەبێت".

ئەوان ڕێگەی خۆیان هەڵبژاردووە، ڕەنگیشە تەنها ئەو کاتە لە ئامانجەکەیان تێبگەن، کە خۆیان لەبەردەمی میوانە نەخوازراوەکەدا دەبیننەوە. ئەوە جوانی ئەو کەسەیە، کە بە پەرۆشی و ڕێزەوە لەسەر بەرەو پێش ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت بەرەو نهێنییەکەی ژیان و تاکە ڕابەری: ڕێگەکەی جوانە و باری سووکە.

ڕەنگە ئامانجەکە گەورە بێت، یان بچوك، دوورەدەست بێت، یان لەبەردەم دەرگاکەیدا بێت، بەڵام دەڕوات و بە ڕێز و شانازییەوە بەدوویدا دەگەڕێت. دەزانێت واتای هەر هەنگاوێك چییە و نرخی ڕەنج و مەشق و ژیریی چەندە.

نەك هەر سەرنج بەتەنها لە پێگەیشتنی ئامانجەکەی دەدات، بەڵکو تێبینی شتەکانی چواردەوری خۆشی دەکات. پێویستە هەندێك جار بۆستێت، چونکە توانای نامێنێت.

لەو ساتانەدا، خۆشەویستی دەردەکەوێت و دەڵێت: "تۆ پێتوایە بەرەو خاڵێکی دیاریکراو ملی ڕێگەت گرتووە، بەڵام تەواوی پاساوی وجوودی ئامانجەکەت، لە خۆشەویستیتدا بۆی، خۆی مەڵاس داوە. کەمێك بحەوێرەوە، بەڵام هەر کە توانات بۆ گەڕایەوە، هەستە و بەردەوام بە. چونکە هەر لەو کاتەوەی دەستت بە گەشتکردن کردووە بەرەو ڕووی، ئامانجەکەت دۆزراوەتەوە و، ئەویش بەرەو ڕووت ڕادەکات تا چاوی پێت بکەوێت.

***

ئەوانەی پرسیارەکە پشتگوێ دەخەن، ئەوانەی وەڵامی دەدەنەوە و ئەوانەش، کە وای لێ تێدەگەن، کە تاکە بەرەنگارییەك بۆ ئەو، کرداره، تووشی هەمان کۆسپ دەبن و هەمان شتگەلیش شادمانیان دەکات. بەڵام تەنها ئەو کەسەی بەزەبوونی و ئازایی پلانی خودا قبوڵ دەکات، دەزانێت کە ڕاڕەوێکی ڕاستی هەڵبژاردووە.

ئەوجا ژنێك كە تەمەنی تێپەڕیبوو و
نەیتوانیبوو مێردێك بۆ خۆی
بدۆزێتەوە، گوتی:

"هەمیشە خۆشەویستی بە جێی هێشتووم".

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

بۆ ئەوەی گوێت لە وشەکانی خۆشەویستی بێت، دەبێت ڕێگە بە نزیکبوونەوەی خۆشەویستی بدەیت.

بەهەرحاڵ، کاتێك نزیك دەبێتەوە، لەوە دەترسین، کە ڕەنگە بیڵێت، چونکە خۆشەویستی ئازادە و ویست و کردارەکانمان ناتوانن فەرمانڕەوایی بکەن.

هەموو عاشقەکان ئەمە دەزانن، بەڵام قبوڵکردنی ڕەتدەکەنەوە. پێیانوایە دەتوانن لە ڕێگەی خۆبەدەستەوەدان، هێز، جوانی، سامان، فرمێسك و خەندەوە خۆشەویستی فریو بدەن.

خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە فریوت دەدات و هەرگیز ڕێگەش نادات فریو بدرێت.

خۆشەویستی گۆڕانکاری دەکات و برین سارێژ دەکات. بەڵام هەندێکجار داوی مەرگئاسا دەنێتەوە و ئەو کەسانە وێران دەکات، کە بڕیاریان داوە بەتەواوەتی خۆیان بەدەستەوە بدەن. باشە ئەو هێزەی کە جیهان

دەجولێنێ و ئەستێرەکان لە شوێنی خۆیان ڕادەگرێت، چۆن دەتوانێت لە هەمانکاتدا هێندە دروستکەر و ڕوخێنەریش بێت؟

ئێمە بەو شێوازە بیرکردنەوەیە فێربووین، کە ئەوەی دەیبەخشین هاوتایە لەگەڵ ئەوەی وەری دەگرین، بەڵام ئەو کەسانەی خەڵکیان خۆش دەوێت و چاوەڕێ دەکەن لەبەرامبەردا خۆش بویسترێنەوە، کات بەفیڕۆ دەدەن.

خۆشەویستی کرداری باوەڕە، گۆڕینەوە نییە.

دژەکان هۆکاری گەشەسەندنی خۆشەویستیین. ململانێکان هۆکاری مانەوەی خۆشەویستیین لەگەڵماندا.

ژیان زۆر کورتە بۆ ئەوەی وشەی گرنگ لە ناختدا بهێڵیتەوە، بۆ نموونە، "خۆشم دەوێیت"، لە دڵماندا زیندانی بکەین.

بەڵام هەمیشە چاوەڕێی بیستنەوەی هەمان وەڵام مەکە. ئێمە خەڵکمان خۆشدەوێت، چونکە پێویستمان بە خۆشەویستییە. بە پێچەوانەشەوە، خۆشەویستی هەموو واتایەك لەدەست دەدات و خۆر لە درەوشانەوە دەوەستێت.

گوڵێك خەون بە یاوەری هەنگ و شادمانییەکەیەوە دەبینێت، بەڵام هیچ هەنگێك بە دیار ناکەوێت. خۆر دەپرسێت:

"ئایا لە چاوەڕوانی بێزار نەبوویت؟"

گوڵەکە لەوەڵامدا دەڵێت، "بەڵێ، بەڵام ئەگەر پەڕەکانم دابخەم، دەپوکێمەوە و دەمرم".

تەنانەت ئەو کاتەش، کە خۆشەویستی بەدیار ناکەوێت، هێشتا بۆ ئامادەبوونی عەشق، بەکراوەیی دەمێنینەوە. هەندێك جار، کاتێك وا دەردەکەوێت تەنیایی هەموو شتێك وردوخاش دەکات، تاکە ڕێگە بۆ بەرەنگاری ئەوەیە لە خۆشەویستییدا بمێنینەوە.

***

ئامانجی گەورەی ژیانمان خۆشەویستی کردنە. باقیەکەی بێدەنگییە.

پێویستە عاشق بین. تەنانەت گەر بەرەو زەوییەکیشمان بەرێت، کە دەریاچەکانی لە فرمێسك دروست بووبن — ئەو شوێنە نهێنییە، زەوی فرمێسك!

فرمێسکەکان قسە دەکەن. کاتێکیش وا هەست دەکەین چەندە پێویستمان بووە گریاوین، لەسەر ڕژان بەردەوام دەبن. کاتێکیش لەو باوەڕەدا دەبین چارەنووس ژیانمانی کردووە بە پیاسەیەکی درێژ بەناو دەشتی پەژارەدا، فرمێسکەکان لەناکاو ون دەبن.

چونکە سەرەڕای ئازارەکە، توانیومانە دڵمان بەکراوەیی بهێڵینەوە.

چونکە بۆمان دەردەکەوێت ئەو کەسەی بەجێی هێشتووین خۆری لەگەڵ خۆیدا نەبردووە، یان تاریکی بەدووی خۆیدا بەجێ نەهێشتووە. زۆر بە سادەیی ئەوان ڕۆیشتوون، هەموو ماڵئاواییەکیش هیوایەکی شاراوە بەدووی خۆیدا دەهێنێت.

وا باشترە خۆش ویسترابی و بەجێ هێڵدرابی وەك لەوەی کە هەرگیز خۆشنەویسترابیت.

***

تاکە هەڵبژاردنی ڕاستەقینە ئەوەیە خۆت لە نهێنی هێزە کۆنترۆڵ نەکراوەکەدا نوقوم بکەیت. دەتوانین بڵێین: "پێشتر ئازارێکی گەورەم چەشتووە و ئەمەش زۆر ناخایەنێت،" بەو شێوەیەش خۆشەویستی لە دەرگاکەمان دەکەینە دەرەوە، ئەگەر ئەوەش بکەین، لە ژیاندا وەك مردوو دەبین.

چونکە سروشت دەرکەوتەیەکی خۆشەویستی خودایە. بێ گوێدانە ئەوەی چی دەکەین، سروشت لەسەر خۆشویستنمان بەردەوام دەبێت. لەبەر ئەوە، با لەوە تێبگەین، کە سروشت فێرمان دەکات و ڕێزی لێ بگرین.

ئێمە عاشق دەبین، چونکە عەشق ئازادمان دەکات، شتگەلێکیش دەڵێین، کە هەرگیز پێشتر غیرەتی ئەوەمان نەبووە بۆ خۆشمانی بچپێنین.

بڕیارێك دەدەین، کە پێشتر بەردەوام وەلامان دەنا.

ئێمە فێر دەبین بڵێین "نەخێر" بەبێ بیرکردنەوە لەو وشەیە وەك نەفرینێك.

فێر دەبین بڵێین "بەڵێ" بەبێ ئەوەی لە ئەنجامەکان بترسین.

هەموو ئەوانە لەیاد دەکەین، کە لەبارەی خۆشەویستییەوە فێری بووین، چونکە هەر بینینێکی چاوەڕوان نەکراو جیاوازە و ئازار و مەستی خۆی دەهێنێت.

بە دەنگێکی بەرزتر گۆرانی دەچڕین کاتێك ئەو کەسەی خۆشمان دەوێت لێمان دوورە و شیعر دەچپێنین کاتێك نزیکە، ئەگەر تەنانەت گوێشمان لێ نەگرێت و تێبینی گۆرانی و چرپەکەشمان نەکات.

چاومان بەڕووی گەردووندا داناخەین و سکاڵای ئەوە بکەین: "تاریکە". بەڵکو چاومان بەتەواوەتی دەکەینەوە، چونکە دەزانین ڕووناکییەکە بەرەو ئەو شتانەمان دەبات، کە هەر خەونیشمان پێوە نەبینیون. ئەوانە هەموو بەشێکن لە عەشق.

دڵمان بۆ خۆشەویستی دەکەینەوە و بێ ترس خۆمانی بۆ بەدەستەوە دەدەین، چونکە هیچ شتێکی ترمان نییە لەدەستی بدەین.

ئەوجا دەڕۆینەماڵەوە و دەبینین کەسێك لەوێ چاوەڕوانمان دەکات، چاو بۆ هەمان شت دەگێڕێت کە ئێمە بەدوویدا دەگەڕاین و چاوەڕوانی هەمان نیگەرانی و پەرۆشییە.

چونکە خۆشەویستی وەك ئەو ئاوەیە، کە دەگۆڕێت بە هەور: بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانەکان و لەوێوە، لە دوورەوە هەموو شتێك دەبینێت، ئاگاداری ئەوەشە، کە دەبێت ڕۆژێك بگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی.

چونکە خۆشەویستی وەك ئەو هەورەیە، کە دەبێت بە باران: بەرەو زەوی شۆڕ دەبێتەوە و ئاوی کێڵگەکان دەدات.

خۆشەویستی تەنها وشەیەکە، هەتا ئەو کاتەی بڕیار دەدەین بە هەموو هێزیەوە داگیرمان بکات.

خۆشەویستی تەنها وشەیەکە، هەتا کەسێك دەگات و واتا دەکات بە بەریدا.

کۆڵ مەدە. لەیادت بێت، هەمیشە دوایین کلیلی ناو گورزەکە دەرگاکە دەکاتەوە.

بەهەرحاڵ، گەنجە پیاوێك ناقایل بوو:

"وشەکانت جوانن، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە هەرگیز هەڵبژاردەیەکی وامان لەبەردەستدا نەبووە. ژیان و کۆمەڵگەکەمان پڕکردنەوەی دەفتەری چارەنووسمانی لە ئەستۆ گرتووە".

پیرە پیاوێکیش ئەمەی زیاد کرد:

"منیش ناتوانم بگەڕێمەوە و ساتە دۆڕاوەکان بگەڕێنمەوە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

ڕەنگە ئەوەی من دەیڵێم لە ئێوارەیەکی داگیرکارییدا سوودی نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، تێبینی وشەکانم بکەن و ڕۆژێك دێت هەمووان بزانن ئێمە چۆن لە قودس ژیاوین.

***

پاش کەمێك بیرکردنەوە، قبتییەکە بەردەوام بوو:

***

کەس ناتوانێت بگەڕێتەوە دواوە، بەڵام هەمووان دەتوانن بەرەو پێش بڕۆن.

سبەینێش، کە خۆر هەڵهات، هەموو ئەوەی پێویستە بەخۆتی بڵێیت ئەوەیە کە:

من ئەم ڕۆژە وەك یەکەم ڕۆژی ژیانم دەگوزەرێنم.

بە سەرسوڕمان و سەرسامییەوە تەماشای ئەندامەکانی خێزانەکەم دەکەم، شادمانیشم بە دۆززینەوەی ئەوەی کە ئەوان لەگەڵ مندان، بەبێ دەنگی قسەگەلێك بۆ یەك هەڵدەڕێژن و کەمێك لەو شتە تێدەگەن کە پێی دەگوترێت خۆشەویستی.

داوای بەشداریکردن لە یەکەم مەشقی ئەو وشترەدا دەکەم، کە لە ئاسۆ دەردەکەوێت، بەبێ ئەوەی بزانم بەرەو کوێ دەچێت. هەر کە شتێکی پڕبایەختریش سەرنجی ڕاکێشام، ئەوێ بەجێ دەهێڵم.

لە سواڵکەرێك ڕەت دەبم، کە داوای پارەم لێ دەکات. ڕەنگە پارەی بدەمێ و ڕەنگیشە بەبیرکردنەوەی ئەوەوە بەجێی بهێڵم، کە پارەکە تەنها لە خواردنەوەدا خەرج دەکات، گوێم لە ڕووسیاکردنەکەشی دەبێت و دەشزانم کە زۆر بەسادەیی ئەوە شێوازی ئاخاوتنیەتی لەگەڵ مندا.

بەتەنیش کەسێکدا تێدەپەڕم، کە هەوڵی ڕووخانی پردێك دەدات. ڕەنگە هەوڵی وەستاندنی بدەم، یان بۆم دەربکەوێت لەبەر ئەوە وا دەکات، کە کەسی تر لەوبەری پردەکەوە چاوەڕێی ناکات. ئەمە ڕێگەی ئەوە بۆ خۆ دوورخستنەوە لە تەنیایی.

بە شێوەیەك تەماشای شتەکان دەکەم وەك بڵێی یەکەم جارمە دەیانبینم، بەتایبەت ئەو شتانەی کە پێیان ڕاهاتووم و جادووەکەیانم لەیاد کردووە. بۆ نموونە، لمی بیابانەکە، وزەیەك دەیجووڵێنێت، کە من لێی تێناگەم — چونکە با کە نابینم.

لەجێی نووسینی ئەو تێبینیانەی کە لەیادم دەچن و لەسەر پارچە پێستەیەك دەیاننووسیم، شیعرێکم ڕەشنووس دەکەم. گەر تەنانەت پێشتریش

دانەیەکم نەنووسیبێت و هەرگیزیش نەینووسمەوە، لانی کەم ئەوە دەزانم، کە جارێك ئازایەتی ئەوەم هەبووە هەستەکانم بکەم بە وشە.

کاتێك دەگەمە گوندێك، کە تەواو شارەزاییم، بە ڕێگەیەکی جیاوازدا بۆی دەچم. دەخنێم و دانیشتوانەکانیش بەیەکتر دەڵێن: "هەڵبەتە شێتە، چونکە جەنگ و وێرانکاری زەوییەکەی بەبێ بەرهەمی بەجێ هێشتووە".

بەڵام لەسەر زەردەخەنەی خۆم بەردەوام دەبم، چونکە زانینم بەوەی ئەوان بە شێتم تێدەگەن شادمانم دەکات. خەندەکردنم ڕێگەی گوتنی منە بۆ: "دەتوانیت جەستەم بشێوێنیت، بەڵام ناتوانیت هیچ لە ڕۆحم بکەیت".

ئەمشەو بەر لەوەی بڕۆم، کات بۆ ڕێکخستنی ئەو گورزە شتە تەرخان دەکەم، کە هەرگیز ئارامی ڕێکخستنیانم نەبووە. بۆیشم دەردەکەوێت، کە کەمێکی مێژووی من لەوێدایە. هەموو پیتەکان، تێبینییەکان، پارچە و پسووڵەکان ژیانی خۆیان دەبەن و چیرۆکی سەیرم بۆ دەگێڕنەوە — لەبارەی ڕابردوو و داهاتووەوە. هەموو شتە جیاوازەکانی جیهان، هەموو ڕێگە گەشت پیاکراوەکان، هەموو دەروازە و دەرچەکانی ژیانم.

ئەو کراسە لەبەر دەکەم، کە زۆرینەی کات لەبەری دەکەم و، بۆ یەکەمجار تێبینی ئەوە دەکەم، کە چۆن دروست کراوە. وێنای ئەو دەستانە دەکەم، کە کەتانەکەی چنیوە و ئەو ڕووبارەی فایبەری ڕووەکەکانی تێدا ڕوێندراوە. تێدەگەم کە هەموو ئەو شتە نەبیندراوانە بەشێکن لە مێژووی کراسەکەم.

تەنانەت ئەو شتانەش، کە پێی ڕاهاتووم -وەك پاپووچەکانم، کە ماوەیەکی زۆر لە پێم کردوون و کۆن بوون- لە نهێنی دۆزینەوەکەدا بەکاردەهێندرێن.

مادام بەرەو داهاتوو ملی ڕێگەم گرتووە، کاتێك قاچم لە ڕابردوو گیرا بە نیشانەی ڕووشاوی پاپووچەکانم یارمەتی خۆم دەدەم.

هیوادارم ئەوەی دەستم بەری دەکەوێ و چاوم دەیبینێ و دەمم تامی دەکات جیاواز بێت، بەڵام هەمان شتە. بەو شێوەیە، هەموو شتەکان ساتی هێمنیان دەشکێنن و لەجێی ئەوە بۆمی ڕوون دەکەنەوە، کە بۆچی تەواوی ئەو ماوە درێژە لەگەڵمدا بوون؛ بۆشم دەردەخەن، کە پەرجووی پێکگەیشتنەوەی عاتیفەکان ڕۆتین نیانی کردوون.

جۆرە چایەك دەخۆمەوە، کە هەرگیز پێشتر تاقیم نەکردۆتەوە چونکە خەڵکانی تر پێیان دەگوتم تامی ناخۆشە. بە شەقامێکدا پیاسە دەکەم، کە هەرگیز پێشتر پێیدا نەڕۆیشتووم، چونکە خەڵکانی تر پێیان دەگوتم بێ بایەخە. بۆشم دەردەکەوێت حەزدەکەم بۆی بگەڕێمەوە یان نا.

ئەگەر سبەی کەشەکەی خۆرین بێت، دەمەوێت بۆ یەکەمجار بە تەواوەتی و گونجاوی تەماشای خۆرەکە بکەم.

ئەگەر هەور بێت، حەزدەکەم تەماشای بکەم تا بزانم پەڵە هەورەکان بەرەو کوێوە دەڕۆن. هەمیشە پێموایە کاتی تەواوم نییە، یان باش تێبینی ناکەم. لەگەڵ ئەوەشدا سبەی، تێبینی ئەو ئاڕاستەیە دەکەم، کە هەورەکان دەیگرنەبەر، یان تەماشای تیشکەکانی خۆرەکە و ئەو سێبەرانە دەکەم، کە دەیخولقێنن.

لە سەرو منەوە ئاسمانێك هەیە، کە بۆ ماوەی هەزاران ساڵە مرۆڤایەتی زنجیرەیەك ڕوونکردنەوەی ماقولیان بۆ دارشتووە.

لەم ساتەدا هەموو ئەو شتانە لەیاد دەکەم، کە لەبارەی ئەستێرەکانەوە فێریان بووم و ئەوانیش جارێکی دی دەبنەوە بە فریشتە، یان بە منداڵ، یان بە هەر شتێك، کە لەم ساتەدا بڕوام پێی هەیە.

کات و ژیان چەندین ڕوونکردنەوەی لۆژیکییان بۆ هەموو شتێك پێ بەخشیوم، بەڵام ڕۆحم لەسەر نهێنی دەژی. من پێویستم بە نهێنییە. دەمەوێت دەنگی خودایەکی تورە لە هەورەگرمەیەکدا ببینم، گەرچی ڕەنگە زۆرینەشتان ئەمەتان بەلاوە کوفر بێت.

پێویستە دووبارە ژیانم بە شتی فەنتازی پڕ بکەم، چونکە خودایەکی توورە زۆر نامۆتر و ترسێنەرتر و پڕبایەخترە لەو دیاردانەی زاناکان ڕوونیان کردوونەتەوە.

بۆ یەکەمجار بەبێ هەست بە تاوانباری دەخنێم، چونکە هەستی شادی گوناهە نییە.

بۆ یەکەمجار خۆم لە هەموو ئەو شتانە لادەدەم، کە دەبنە مایەی ناخۆشی، چونکە چەشتنی ناخۆشی چاکەکاری نییە.

سکاڵا لەسەر ژیان ناکەم و بڵێم: "هەموو شتەکان هەمیشە هەر بە هەمان شێوەن و منیش ناتوانم بیانگۆڕم". چونکە من ئەم ڕۆژە وەك یەکەم ڕۆژی ژیانم دەژیم و، چەندەش بمێنمەوە، ئەو شتانە دەدۆزمەوە، کە هەر نەشمدەزانی بوونیان هەیە.

ئەگەرچی پێشتر چەندەها جاری بێ شومار بەو شوێنەدا تێپەڕیوم و "بەیانی باش"م کردووە، بەڵام "بەیانی باش"ی ئەم ڕۆژە جیاواز دەبێت. تەنها نابێتە دەستەواژەیەکی ڕەوشتدار، بەڵکو دەبێتە فۆڕمێکی پیرۆزیی، بە هیوای ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی قسەیان لەگەڵدا دەکەم لە واتای گرنگی ژیان تێبگەن، ئەگەرچیش تراژیدیا هەڕەشەی نوقومکردنە ناوخۆیمان لێ دەکات.

تێبینی وشەی گۆرانی هونەرمەندێکی سەر شەقام دەکەم، ئەگەرچی خەڵکانی تر گوێشی لێ ناگرن، چونکە ترس ڕۆحیانی قورس کردووە. میوزیکەکە دەڵێت: "خۆشویستی فەرمانڕەوایی دەکات، بەڵام کەس نازانێت تەختە شاهانەییەکەی لەکوێیە؛ بۆ زانینی ئەو شوێنە نهێنییەش، دەبێت یەکەمجار خۆت بۆ عەشق بە دەستەوە بدەیت".

منیش غیرەتی کردنەوەی دەرگای ئەو شوێنە پیرۆزەم دەبێت، کە بەرەو ڕۆحم ڕێ دەکات.

بە جۆرێك تەماشای خۆم دەکەم هەر وەك بڵێی یەکەمجارە پەیوەندی بە جەستە و ڕۆحمەوە دەکەم.

هیوادارم بتوانم خۆم وەك خۆم قبوڵ بکەم: کەسێك، کە هەر وەك خەڵکانی تر دەڕوات و هەست دەکات و قسە دەکات، بەڵام سەرەڕای هەڵەکانی، ئازاشە.

هیوادارم سەرم لە سادەترین ئاماژەم بسوڕمێت، هەر وەك ئەوەی لەگەڵ بێگانەیەکدا قسە بکەم؛ بە ئاساییترین سۆزم، هەر وەك ئەوەی، کە لە بەغداد لە کاتی هەڵکردنی با کەدا هەستم دەکرد لمەکە بەر دەموچاوم

دەکەوێت؛ لە نەرمترین ساتدا، هەر وەك ئەو کاتەی ژنەکەم بە تەنیشتمەوە خەوتووە و هەوڵ دەدەم وێنای بکەم، کە خەون بە چییەوە دەبینێت.

ئەگەر لەسەر جێگەی خەویش بەتەنیا بم، دەچمە بەر پەنجەرەکە، تەماشایەکی ئاسمان دەکەم و دڵنیا دەبم، کە تەنیایی درۆیە، چونکە گەردوون بەردەوام یاوەریم دەکات.

بەو شێوەیەش هەر کاتژمێرێکی ژیانم دەبێتە سەرسامییەکی هەمیشەیی، بۆ ئەو "من"ەی، کە نە دایکم و نە باوکم و نە خوێندنگە دروستی نەکردووە، بەڵکو بە هەموو ئەو شتانە دروست بووە، کە هەتا ئێستا ئەزموونم کردوون، لەناکاویش هەموویان لەبیر دەکەم تا شتی نوێ بدۆزمەوە.

ئەگەر ئەمە دوایین ڕۆژی ژیانیشم بێت لەسەر زەوی، بە خۆشترین شێوە دەیگوزەرێنم، چونکە بە ڕۆحی منداڵێکی بێ تاوانەوە دەژیم، هەر وەك بڵێی بۆ یەکەمجارم بێت، کە تەواوی شتەکان ببینم.

ئەوجا ژنی بازرگانێك گوتی:

"باسی سێكسمان بۆ بكە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

ژن و پیاوان بۆ یەکدی دەچێنن، چونکە ئاماژەیەکی پیرۆزیان کردۆتە کردارێکی پڕتاوان.

ئەمە ئەم جیهانەیە، کە تێیدا دەژین. تالانکردنی ساتی ئێستاش لە حەقیقەتەکەی شتێکی ترسناکە، دەکرێت یاخیبوون ببێتە شتێکی بە بەها، ئەگەر بزانیت چۆن بەکاری دەهێنیت.

ئەگەر دوو جەستە لێك ببەسترێن، ئەوە سێکس نییە، تەنها خۆشییە.

لە سێکسدا، حەوانەوە و پەشۆکان دەست لەدەست دەڕۆن، هەر وەك چۆن ئازار و شادی و شەرم و غیرەت دەچنە پشت سنووری کەسێکەوە.

چۆن دوو دۆخی وا جیاواز لە هارمۆنییەکدا پێکەوەن؟ تەنها یەك ڕێگە هەیە: بە خۆبەدەستەوەدانت.

چونکە کرداری خۆبەدەستەوەدان واتای ئەمەیە: "بڕوات پێ دەکەم".

وێناکردنی هەموو ئەو شتانەی کە ڕەنگە ڕووبدەن، لەکاتێکدا ڕێگە بە خۆمان دەدەین، نەك هەر جەستەمان، بەڵکو ڕۆحیشمان لێك بئاڵێن، بەس نییە.

با خۆمـان نوقـوم بکـەین و، پاشـانیش، بـەرەو خـوارەوەی ڕاڕەوی خۆبەدەستەوەدان بـڕۆین. ڕەنگـە ترسناك بێـت، بـەڵام تاکـە ڕێگەیـە، کـە شایانی شوێنکەوتن بێت.

ئەگەر ئەمەش ببێتە هۆی گۆڕانکارییـەکی سـەرەکی لـە جیهـانی ئێمـەدا، هـیچ شتێکمان نییـە تـا لەدەسـتی بدەین، چونکە بـە کردنـەوەی دەرگـای یەکێتی جەستە و ڕۆح، ئەوەی چنگمان دەکەوێت خۆشەویستی تەواوەتییە.

با بیرۆکـەی ئـەوە لـەیاد بکـەین، کـە بەخشـین خانەدانییـە و وەرگـرتن زەبوونییە. بۆ هەندێك خەڵك بەخشندەیی تـەنها لـە بەخشیندایە، هێشـتاش وەرگرتن کردارێکی خۆشەویستییە. ڕێگەدان بـە کەسـێك بـۆ شـادمانکردنمان دەبێتە مایەی شادمانی ئەویش.

***

کاتێـك لـە کـرداری سێکسـدا زۆر بەخشـندە دەبـین و تاکـە هۆکـاری سـەرەکیمان خۆشـی بەرامبەرەکەمانـە، دەشـێت شـادمانی خۆمـان کـەم ببێتەوە، یان تەنانەت لەناویش بچێت.

کاتێك بە هەمان گوڕ و تینـەوە توانـای بەخشـین و وەرگرتنمـان دەبێـت، جەستەمان وەك دەزووی کەوانێك پەشـێو دەبێ، بـەڵام مێشـکمان وەك ئـەو تیرە ئامادە دەبێت، کە خەریکە دەهاوێژرێت. ئیدی مێشکمان لـەکاردا نییـە؛ غەریزە تاکە ڕابەرمانە.

کاتێـك جەسـتە و ڕۆح پێـك دەگـەن و وزەی پیرۆزیـش، نـەك تـەنها ئـەو بەشانە پڕدەکات، کە لای زۆرینـەی خـەڵکی بـە خرۆشـێنەر ناسـراون، بـەڵکو تەنانـەت هـەموو تاڵـە موویـەك و پێسـتیش پـڕ دەکـات، بـەو شـێوەیەش

ڕووناکییەکی ڕەنگ جیاواز دەخولقێنن. دوو ڕووبار پێك دەگەن تا ڕووبارێکی جوانتر و بەهێزتر دروست بکەن.

هەر شتێك، کە ڕۆحانییە خۆی لە فۆڕمی دیاردا پیشان دەدات و، هەر شتێکیش کە دیارە خۆی دەگۆڕێت بە وزەیەکی ڕۆحانی.

هەموو شتێك ڕێگەپێدراوە، ئەگەر هەموو شتێك قبوڵ بکرێت.

هەندێکجار عەشق لە قسەکردن بەنیانی ماندوو دەبێت. لەبەر ئەوە، لێی گەڕێ با بەتەواوی مەزنییەوە خۆی دەربخات، وەك خۆر بسووتێ و بە باکەشی تەواوی دارستانەکان وێران بکات.

ئەگەر یەکێك لە عاشقەکان بەتەواوەتی خۆی بەدەستەوە بدات، ئەوی تریشیان هەر هەمان شت دەکات، چونکە لەئامێزگرتن دەبێتە زانخوازی، زانخوازیش بەرەو گەڕان بەدووی هەموو ئەو شتانەدا پەلکێشمان دەکات، کە لەبارەی خۆمانەوە نەمانزانیووە.

سێکس وەك دیارییەك و گۆڕینێکی نەریتی ببینە. لە هەموو نەریتێکیشدا، نەشوە بۆ شکۆدارکردنی کۆتاییەکە ئامادە دەبێت، بەڵام ئەوە تاکە ئامانج نییە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە من لەگەڵ هاوەڵەکەم گەشتمان بە ڕێگەیەکدا کردووە، کە بەرەو هەرێمێکی نەناسراوی بردووین، کە لەوێ ئاڵتوون و مێری* بە نرخمان دۆزیوەتەوە.

واتای پیرۆزی تەواو بە پیرۆزییەکە ببەخشە. ئەگەر ساتی گومانیش هاتە پێشێ، هەمیشە لەیادت بێت: ئێمە لەو ساتانەدا بە تەنیا نین؛ هەردوو لا هەر هەمان هەستیان هەیە.

---

* مێر: جۆرە دارێکی بۆن خۆشە.

بێ ترس سندوقی نهێنی فانتازیاکانت بکەرەوە. غیرەتی کەسێك یارمەتی کەسەکەی تریش دەداتە کە هەر بەشێوەی ئەو ئازا بێت.

عاشقە ڕاستەقینەکان بەبێ ترسی هەڵسەنگاندن دەچنە باخچەی جوانییەوە. ئیدی ئەوان دوو جەستە یان دوو ڕۆح نین کە چاویان بەیەکدی بکەوێت، بەڵکو تاکە نافورەیەکن، کە ئاوی ڕاستەقینەی ژیانی لێ هەڵدەقوڵێت.

ئەستێرەکان تەماشای جەستەی ڕووتی عاشقەکان دەکەن، ئەوانیش هەست بە شەرمەزاری ناکەن. باڵندەکان لە نزیکیانەوە دەفڕن، عاشقەکانیش لاسایی گۆرانی باڵندەکان دەکەنەوە. ئاژەڵی کێوی بە وریایی لێیان نزیك دەبنەوە، چونکە ئەوەی دەیبینن زۆر لە خۆیان کێویترە. ئەوجا سەریان وەك نیشانەیەکی ڕێز و خۆبەدەستەوەدان نەوی دەکەن.

ئەوجا کات لە وجوودی خۆی دەوەستێت، چونکە لە زەوی شادمانی-لەدایکبوو-لە-عەشقی-ڕاستەقینەوە، هەموو شتێك نەمرە.

یەکێك لە جەنگاوەرەکان کە بۆ ڕۆژی
دواتر ئامادەی مردن بوو، بەڵام لەگەڵ
ئەوەشدا، بڕیاری دابوو بێتە گۆڕەپانەکە
تا بزانێت قبتییەکە چی دەڵێت،
تێبینییەکی دا:

"ئێمە دابەش کراین کاتێك ئەوەی دەمانویست
یەکێتی بوو. ئەو شارانەی لە ڕاڕەوی
داگیرکەرەکاندان تووشی ئازاری دەرەنجامی جەنگێك
بوون، کە خۆیان هەڵیان نەبژاردووە.
ئایا ئەوانەی کە ڕزگاریان دەبێت،
دەبێ چی بە منداڵەکانیان بڵێن؟"

**لەوەڵامدا گوتی:**

***

ئێمە بەتەنیا لەدایك بووین و بەتەنیاش دەمرین. بەڵام تا لەسەر ئەم هەسارەیە بین، دەبێت قایلبین بە شکۆمەندکردنی کاری باوەڕمان لە ڕێگەی خەڵکی ترەوە.

کۆمەڵگە ژیانە: لەوێوە توانای ڕزگاریمان پێ دەگات. کاتێك لە ئەشکەوتەکاندا دەژیاین بەو شێوەیە بوو و ئەمڕۆش هەر بەو شێوەیەیە.

ڕێز لەوانە بگرە، کە بە تەنیشتی تۆوە گەورەبوون و فێربوون. ڕێز لەوانە بگرە، کە فێریان کردیت. کە ڕۆژی خۆی هات، چیرۆکەکانت بگێڕەرەوە و خەڵکی فێربکە؛ بەو شێوەیەش کۆمەڵگە بەردەوام دەبێت و نەریتەکانیشمان بە نەگۆڕاوی دەمێننەوە.

هەر کەسێك ساتەکانی خۆشی و بێ ورەیی لەگەڵ خەڵکی تردا بەش نەکات، هەرگیز بە تەواوەتی توانا و کەموکوڕییەکانی خۆی بۆ ڕوون نابێتەوە.

***

لەهەمان کاتدا، ئاگاداری ئەو مەترسییەبە، کە هەڕەشە لە هەموو کۆمەڵگەکان دەکات: خەڵکی بەرەو ڕێگەیەکی ستانداردی ڕەفتارکردن پەلکێش کراون، سنوور و ترس و کینەی خۆیان وەك نموونە بەکاردەهێنن.

ئەوەش نرخێکی باشە، چونکە بۆ ئەوەی قایل بیت، دەبێت هەموو کەسێك شادمان کەیت.

ئەوەش بەڵگەی ئەوە نییە، کە کۆمەڵگەت خۆش بوێت، بەڵکو بەڵگەی خۆشنەویستنی خودی خۆتە.

ئەوکاتە ڕێزت دەگیرێت و خۆش دەویسترێیت، کە خەڵکیت خۆش بوێت و ڕێزیان بگریت. هەرگیز هەوڵی شادمانکردنی هەموو کەسێك مەدە؛ ئەگەر وا بکەیت، نابیتە مایەی ڕێزی هیچ کەس.

لەناو ئەو خەڵکانەدا بۆ هاوڕێ و هاوپەیمان بگەڕێ کە بڕوا بە خۆیان و ئەوە دەکەن، کە ئەنجامی دەدەن.

من ناڵێم: "بۆ کەسێك بگەڕێ، کە ڕێك وەکو تۆ بیر بکاتەوە". بەڵکو دەڵێم: "بەدووی ئەوانەدا بگەڕێ کە جیاواز لە تۆ بیر دەکەنەوە و هەرگیز ناتوانیت قایلیان بکەیت، کە تۆ ڕاستیت".

چونکە هاوڕێیەتی یەکێکە لە دەموچاوەکانی خۆشەویستی، خۆشەویستیش لە بیر و ڕاوە دروست نابێت؛ خۆشەویستی هاوەڵی خۆی بەبێ مەرج دانان قبوڵ دەکات و ڕێگە بە هەر کەسێك دەدات لە ڕێگەی خۆیەوە بەرەو پێش بچێت.

خۆشەویستی کاری باوەڕکردنە بە کەسێکی تر، کاری خۆبەدەستەوەدان نییە.

هەوڵ مەدە بە هەر نرخێك بێت خۆش بویسترێیت، چونکە خۆشەویستی نرخی نییە.

هاوڕێکانت لەو جۆرە نین سەرنجی هەموو کەسێك بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و بڵێن: "هیچ کەسێکی باشتر، بەخشندەتر، یان چاکەکارتر لە تەواوی قودسدا بوونی نییە".

هاوڕێکانت لەو جۆرەن، کە چاوەڕێی ڕوودانی شتەکان ناکەن تا بزانن کام ئاڕاستە بگرنە بەر؛ ڕێك لەو ساتەدا بڕیار دەدەن، ئەگەر چی ئەشزانن، کە ڕەنگە ببێتە شتێکی مەترسیدار.

ئەوان ئەو ڕۆحە ئازادانەن، کە هەر کات ژیان داوای کرد دەتوانن ئاڕاستە بگۆڕن. بۆ ڕاڕەوی نوێ دەگەڕێن، سەرکەشییەکانیان ژماردە دەکەنەوە، بەو شێوەیەش شار و گوندیش دەوڵەمەند دەکەن.

ئەگەر جارێك ڕاڕەوێکی هەڵە و مەترسیداریان گرتە بەر، هەرگیز نایەن پێتبڵێن: "نەکەیت کاری وا بکەیت".

تەنها دەڵێن: "جارێك ڕاڕەوێکی هەڵە و مەترسیدارم گرتەبەر".

ئەمە لەبەر ئەوەیە، کە ڕێز لە ئازادییەکەت دەگرن، هەر چۆن تۆش ڕێز لە هی ئەوان دەگریت.

بە هەر نرخێك بێت خۆت لەو کەسانە دووربخەرەوە، کە تەنها لە ساتی غەمبارییدا دێنە لات و دڵت دەدەنەوە. ئەوەی لە ڕاستییدا بە خۆیانی دەڵێن ئەوەیە کە: "من بەهێزترم. من زاناترم. من ئەم هەنگاوەم نەنا".

لەو کەسانە نیزک ببەرەوە، کە لە ساتی شادییدا بە تەنیشتتەوەن، چونکە ئەوان ئێرەیی بردن و لەچەری لە دڵیاندا نییە، تەنها دەیانەوێت تۆ بە شادمانی ببینن.

خۆت لەو کەسانە بە دوور بگرە، کە پێیان وایە لە تۆ بەهێزترن، چونکە لە ڕاستیدا شکستەنی خۆیان دەشارنەوە.

لەو کەسانە نزیك ببەرەوە کە لە لاوزبوون ناترسن، چونکە ئەوان بڕوایان بە خۆیان هەیە و دەزانن، کە لە هەندێك حاڵەتی ژیانماندا دەکەوین؛ ئەوان ئەمە بە خاڵێکی لاوازی نادەنە قەڵەم، بەڵکو بە مرۆڤایەتی دەزانن.

خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە، کە بەر لە کردار قسەیەکی زۆری لەسەر دەکەن، ئەو کەسانەی کە هەرگیز هەنگاوێك نانێن ئەگەر دڵنیا نەبن ئەو هەنگاوە دەبێتە مایەی ڕێزیان.

خۆت لەو کەسانە نزیك بکەرەوە، کە کاتێك هەڵەیەکت کردووە، هەرگیز نەیانگوتووە: "من ئەوەم بە شێوەیەکی جیاواز ئەنجام دا". ئەوان لەو جۆرە هەڵەیەیان نەکردووە و بۆیان نییە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن.

خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە، کە لەبەر ئەوە بۆ هاوڕێ دەگەڕێن، کە درێژە بە دۆخێکی کۆمەڵایەتی بدەن، یان بۆ ئەوەی ئەو دەرگایانە بکەنەوە، کە بەبێ تۆ هەر نەشیاندەتوانی لێی نزیك ببنەوە.

لەو کەسانە نزیك ببەرەوە، کە بەتەنیا بایەخ بە کردنەوەی دەرگایەکی گرنگ دەدەن — دەرگای دڵی تۆ. کە هەرگیز بەبێ قایلبوونی خۆت ڕۆحت داگیر ناکەن، یان تیرێك ناگرنە دەرگا کراوەکە.

هاوڕێیەتی وەك ڕووبارە: بە دەوری بەرددا ورووژم دەبات، خۆی لەگەڵ دۆڵ و چیادا دەگونجێنێت، جار جارە دەچێتە گۆمێکەوە هەتا پڕدەبێت و لەسەر ڕۆیشتنی خۆی بەردەوام دەبێت.

هەر وەك هەرگیز ڕووبار لەیادی ناکات، کە ئامانجی ئەو دەریایە، هاوڕێیەتییش هەرگیز لەیادی ناکات، کە تاکە هۆکارێك بۆ بوونی خۆشویستنی خەڵکانی ترە.

خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە، کە دەڵێن: "ئاوهایە، لەمە زیاتر ناڕۆم". چونکە ئەوەی ئەوان نەیانتوانیووە بەسەریدا زاڵ بن ئەوەیە نە مردن و نە ژیان کۆتاییان نییە؛ ئەوان تەنها قۆناغی نەمریین.

خۆت لەو کەسانە نزیك بگرە، کە دەڵێن: "هەموو شتێك باشە، بەڵام هێشتا دەبێت بەردەوام بین". چونکە ئەوان لەوە تێدەگەن، کە دەبێت لەسەر ڕۆیشتنیان بەرەو ئاسۆی نەناس بەردەوام بن.

خۆت لەو کەسانە بە دوور بگرە، کە بۆ گفتوگۆکردنی، جیدی بێت یان نا، هەر بڕیارێك، کە کۆمەڵگە پێویستە بیدات، چاویان پێت دەکەوێت. ئەوان لە سیاسەت تێدەگەن؛ سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن و دەیانەوێت پیشانی بدەن، کە چەندە زرنگن. ئەوەی کە لێی تێناگەن ئەوەیە، کە زەوتکردنی وەرینی تاکە یەك تاڵە موو لە سەرت شتێکی مەحاڵە. شتێکی گرنگە، بەڵام پێویستی بەوەیە دەرگا و پەنجەرەی بۆ ژێری و شتە چاوەڕوان نەکراوەکان بخرێتە سەر پشت.

لەو کەسانە نزیك ببەرەوە، کە گۆرانی دەڵێن، چیرۆك دەگێڕنەوە و شادی لە ژیان وەردەگرن، ئەوانەی کە شادمانی لە چاویاندا

دەدرەوشــێتەوە. چــونکە شــادمانی ســارییە و هــەر زوو چارەســەرێك دەدۆزێتەوە، لە کاتێکدا لۆژیك تـەنها دەتوانێـت ڕوونکردنەوەیـەك بـۆ هەڵـە ئەنجامدراوەکان بدۆزێتەوە.

لەو کەسانە نزیك ببەرەوە، کە ڕێگە دەدەن ڕووناکی خۆشەویستی بـەبێ سنووردارکردن، هەڵسەنگاندن و خـەڵات بەسەریاندا بدرەوشێتەوە، بـە بـێ ئەوەی ڕێگە بدەن ترسی خراپ تێگەیشتن ڕێگە لە ڕووناکییەکە بگرێت.

گرنگ نییە هەستت چۆنە، هەموو سپێدەیەك لـە خـەو ڕابـێ و ئامـادە بـە ڕووناکیەکەت بەسەرتدا بدرەوشێتەوە.

ئەوانەی بە چاو دەبیـنن چـاویان بـە ڕووناکییەکـە دەکـەوێت و سـیحریان لـێ دەکات.

ژنێکی گەنج کە بەدەگمەن ماڵەوەی بە جێ دەهێشت لەبەر ئەوەی پیاوبوو کەس بایەخی پێ نادات، گوتی:

"فێری کەشخەییمان بکە".

هەموو ئامادەبووانی ناو گۆڕەپانەکە منگەیان دەهات، "ئەمە چ جۆرە پرسیارێکە لە کاتێکدا خەریکە وڵاتەکەمان داگیر دەکرێت و
بەمزووانە تەواوی شەقامەکانی شار بە خوێن ئاو دەدرێن؟

بەهەرحاڵ، قبتییەکە خەندەیەکی کرد، خەندەکەی گاڵتەجاڕانە نەبوو، بەڵکو پڕبوو لە ڕێز بۆ غیرەتی ئەو ژنە گەنجە.

لەوەڵامدا گوتی:

***

پێزانینی کەشخەیی لە ڕووکار و ڕووکەشدا شتێکی هەڵەیە. هیچ شتێک هێندەی ئەوە لە ڕاستییەوە دوور نییە: هەندێک وشە کەشخەن، هەندێکیتر بریندار و وێرانکاری دەسازێنێت، بەڵام هەموویان هەر بە هەمان پیتگەل دەنووسرێن. گوڵ کەشخەیە، تەنانەت ئەو کاتەش، کە لەناو گیاکانی مێرگێکدا دەشاردرێنەوە. ڕاکردنی ئاسک کەشخەیە، تەنانەت ئەو کاتەش، کە لە دەستی شێرێک هەڵدێت.

کەشخەیی جوانییەکی دەرەکی نییە، بەڵکو بەشێکە لە ڕۆح، کە بەڕووی خەڵکانی تردا ئاشکرایە.

کاتێکیش سۆزەکان بەتین دەبن، کەشخەیی ڕێگە نادات بەستەری ڕاستەقینەی نێوان دوو مرۆڤ بشکێت.

کەشخەیی لەو بەرگانەدا نییە، کە دەیانپۆشین، بەڵکو لە شێوازی پۆشینەکەیاندایە.

لە باش بەکارهێنانی شمشێردا نییە، بەڵکو لەو گفتوگۆیەدایە، کە لە خۆپاراستن لە جەنگ دەیسازێنین.

***

کەشخەیی ئەو کاتە بەدەست دێت، کە دەستبەرداری هەموو ئەو شتە زیاد لە پێویستانە ببین، سادەیی و خۆچڕکردنەوە دەدۆزینەوە. چەندە بە سادەیی بۆستین، هێندە باشترە؛ چەندە لەسەر خۆمان بین، هێندە جوانترە.

ئەی سادەیی چییە؟ پێکەوە هاتنی بەها ڕاستەقینەکانی ژیانە.

بەفر جوانە، چونکە تەنها یەك ڕەنگی هەیە.

دەریا جوانە، چونکە تەخت و ڕێك دەردەکەوێت.

بیابان جوانە، چونکە تەنها لە بەرد و لم پێکهاتووە.

بەهەرحاڵ، کاتێك نزیکتر تەماشای شتەکان دەکەین، زیاتر کاریگەریی و بێ خەوشییەکەیمان بۆ دەردەکەوێت و دان بە جۆرایەتییەکەیدا دەنێین.

سادەترین شتەکانی ژیان شتە هەرە سەرو سروشتییەکانن. لێگەڕێ خۆیان دەربخەن.

ڕابمێنە چۆن شلێرەکانی کێڵگەکان گەشە دەکەن: نە ڕەنج دەدەن و نە دەسووڕێن. هێشتاش کەسێکی ژێر بەو هەموو شکۆمەندییەیەوە وەك شلێرێك ڕێك نییە.

چەندێك دڵ لە سادەییەوە نزیك بێت، هێندە زیاتر توانای خۆشەویستی دەبێت بە ئازادی و بێ ترسی. چەندە بێ ترس خۆشی بوێ، هێندە زیاتر توانای دەرخستنی کەشخەیەتی دەبێت لە هەموو ئاماژەیەکدا.

کەشخەیەتی پەیوەندی بە تامخۆشییەوە نییە. هەموو کولتوورێك فیکرەی خۆی لەسەر جوانی هەیە، کە بەتەواوەتی لە کولتووری ئێمە جیاوازە.

بەڵام هەموو هۆزێك، هەموو مرۆڤێك، بەهای خۆیان هەیە، کە پەیوەستە بە کەشخەییەوە: میوانداری، ڕێز، ڕەفتاری جوان.

لووتبەرزی دەبێتە هۆی کینە و لەچەری. کەشخەیی ڕێز و خۆشەویستی بەرز دەکاتەوە.

لووتبەرزی دەبێتە هۆی ئەوەی هاوڕێ ژن و پیاوەکانمان زەبوون بکەین. کەشخەیی فێرمان دەکات لە ڕووناکیدا پیاسە بکەین.

لووتبەرزی وشەکان ئاڵۆز دەکات، چونکە پێیوایە زرنگی تەنها بۆ چەند کەسێکی هەڵبژێردراوی کەمن. کەشخەیی بیرۆکەی ئاڵۆز دەگۆڕێت بە شتێك، کە هەموو کەسێك توانای لێ تێگەیشتنی هەبێت.

کاتێك بە ڕاڕەوی هەڵبژێردراوی خۆماندا دەڕۆین، بە کەشخەیی دەڕۆین و بەلێشاو ڕووناکیمان لێ دێتە دەرێ. هەنگاوەکانمان جێگیرن، سەرنجمان بڕەرە، جووڵەمان جوانە. تەنانەت لە ساتی تەنگوچەڵەمەکانیشدا ڕکابەرەکانمان نیشانەی لاوازی نابینن، چونکە کەشخەییمان دەمانپارێزێت.

کەشخەیی قبوڵکراو و دان پیانراوە، چونکە بە کەشخەبوون هیچ ڕەنجێکی گەرەك نییە.

تەنها خۆشەویستی فۆڕمی ئەوە دەبەخشێت، کە جارێك لە جاران هەر خەونی هەبوونیشمان پێوەی نەبینیوە.

تەنها کەشخەییش ڕێگە دەدات ئەو فۆڕمە بەردەست ببێت.

ئەوجا پیاوێك كە هەموو سپێدەیەك زوو لەخەو هەڵدەستا

تا ڕانە مەڕەكەی بۆ لەوەڕگاكان بەرێت،

گوتی:

"تۆ خوێندوتە تا توانای گوتنی ئەم وشە

جوانانەت هەبێت، بەڵام ئێمە دەبێت هەموو

ڕۆژێك كار بكەین تا یارمەتی خێزانەكانمان بدەین".

لەوەڵامدا گوتی:

***

وشـەی جـوان لەلایـەن شـاعیرەکانەوە بـەیان دەکرێـت. ڕۆژێکـیش دێـت کەسێك بنووسێت:

*خەوم لـێ کەوت و لە خەونمدا ژیان زۆر*
*جوان بوو.*
*بەئاگا هاتم و بۆم دەرکەوت ژیان*
*ئەرکە.*
*ئەرکەکەم ڕاپەڕاند و بۆم دەرکەوت ژیان*
*جوانە.*

کار دەرکەوتەی خۆشەویستییە، کە خەڵکی پێکـەوە دەبەسـتێتەوە. لـەو ڕێگەیەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە ئێمە نـاتوانین بـەبێ خـەڵکانی تـر بـژین و هەر بەو شێوەیە کەسانی تریش پێویستیان بە ئێمەیە.

دوو جۆر کار هەیە.

کاری یەکەم ئەوەیە، کە پێویستە بۆ پەیداکردنی نانی ڕۆژانە ئەنجامی بدەین. لەو حاڵەتەشدا خەڵکی کاتەکانی خۆیان دەفرۆشن، نازانن، کە ئیدی هەرگیز جارێکی تر بۆیان ناکڕدرێتەوە.

تەواوی بوونیان خەون بەو ڕۆژەوە دەبینن، کە بتوانن لەکۆتاییدا بحەوێنەوە. کاتێکیش ئەو ڕۆژە دێتە پێشێ، هێندە پیر دەبن، کە توانای خۆشی وەرگرتنیان لەو شتانە نامێنێت، کە ژیان پێشکەشیانی دەکات. خەڵکی لەو جۆرە هەرگیز بەرپرسیارێتی کردارەکانیان ناگرنە ئەستۆ. ئەوان دەڵێن: "هیچ هەڵبژاردەیەکی ترم نییە".

بەهەرحاڵ، جۆرێکی دیکەی کارکردنیش هەیە، کە ئەویش هەر بۆ دابینکردنی گوزەرانی ڕۆژانەیە، بەڵام لەمەیاندا خەڵکی هەوڵ دەدەن هەر خولەکێکیان بە خۆتەرخانکردن و خۆشەویستی بۆ کەسانی دیکە پڕ بکەنەوە.

ئێمە بەم جۆرە کارەیان دەڵێین بەخشین.

بۆ نموونە، دوو کەس هەمان ژەمە خواردن دروست دەکەن و هەر هەمان کەرەستەش بەکاردەهێنن، بەڵام یەکێکیان خۆشەویستی بەسەر کارەکەیدا دەڕژێنێ و ئەوی دیکەشیان تەنیا هەوڵی تێرکردنی ورگی دەدات. ئەگەر چی خۆشەویستی شتێك نییە ببیندرێ، یان بگیرێ، بەڵام ئەنجامەکە بە تەواوەتی جیاواز دەبێت.

ئـەو کەسـەی قوربـانی پێشـکەش دەکـات هەمیشـە خـەڵات دەکرێـت. چەندێك خۆشەویستی خـۆی ببەخشـێت، ئەوەنـدە خۆشەویستییەکەی زیـاد دەکات.

کاتێـك وزەی پـیرۆز گـەردوون دەخاتـە جووڵـە، تـەواوی هەسـارە و ئەستێرەکان، تەواوی دەریـا و دارسـتانەکان، تـەواوی دۆڵ و چیاکان بـواری ئەفراندنیان پێ دەبەخشرێت. هەمان شت بەسەر مرۆڤایەتیشدا ڕوودەدات.

هەندێك گوتیان: "نـەخێر، ئێمـە نامانـەوێت. ئێمـە نـاتوانین هەڵـە ڕاسـت بکەینەوە، یان سزای نادادپەروەری بدەین".

خەڵکانی دیکە گوتیان: "بە عارەقەی ناوچاوانم ئـاوی کێڵگـەکان دەدەم، ئەوەش دەبێتە ڕێگەی من بۆ بەرز نرخاندنی خالق".

ئەوجا ئەهریمەن هات و بە دەنگی شیرینی خۆی گوتی: "دەبێت تا سـەر لوتکەی چیاکە بەردەکە بەیت بە شانتدا، کاتێکیش دەگەیتـە ئـەوێ، دیسـان خل دەبێتەوە بۆ سەر زەوییەکەی بنکی چیاکە".

ئەوانەش بڕوایان بە ئەهریمـەن کـرد گوتیـان: "تاکـە واتـای ڕاسـتەقینەی ژیان ئەوەیە هەمان کار دووبارە و دووبارە بکەیتەوە".

ئەوانەش بڕوایان بە ئەهریمەن نەکرد لەوەلامدا گوتیان: "من ئەو بـەردەم خـۆش دەوێـت، کـە دەیبەمـە سـەر لوتکـەی چیاکە. بـەو شـێوەیەش هـەر خولـەکێك، کـە لەگەڵیـدا دەیبەمـە سـەر، دەبێـت ئـەو خولەکانـەی کـە بـۆ خۆشەویستەکەمی تەرخان دەکەم".

بەخشین نزایەکی بێ جیهانە. وەك هەموو نزایـەکی تـریش، پێویسـتی بـە دیسپلین هەیە – ڕێکوپێکی کۆیلایەتی گەرەك نییـە، بـەڵکو هـی هەڵبـژاردنی ئازادی دەوێت.

هـیچ حیکمـەتێك لـە گـوتنی ئەمـەدا نییـە: "چارەنووس عەدالـەت نـەبوو لەگەڵمدا. ئێستا خەڵکانی دیکە شوێنی خەونەکانی خۆیان کـەوتوون، کەچـی ئەوەتا من کاری خۆم دەکەم تا گوزەرانێك دابین بکەم".

چارەنووس هەرگیز ستـەمکاری بەرامبـەر بـە هـیچ کەسـێك ناکـات. ئێمـە هەموو ئازادین لە قین لـێ بوون، یان خۆشویستنی ئەوەی دەیکەین.

کاتێـك خۆشمـان دەوێـت، ئێمـەش هـەمان شـادمانی لـە چـالاکییەکانی ڕۆژانـــەمان وەردەگـــرین، هـــەر بەشـــێوەی ئەوانـــەی ڕۆژێـــك بـــە دووی خەونەکانیاندا دەڕۆن.

کەس گرنگی و مەزنی ئەوە نازانێت، کە ئەنجامی دەدات. بەو شێوەیەش نهێنی و جوانی بەخشینەکە دەمێنێتەوە: ئەوە ئەو کارەیە، کـە پێمـان دراوە و باوەڕمان پێ کراوە، لەبەر ئـەوە دەبێـت ئێمـەش لەبەرامبـەردا بـڕوای پـێ بکەین.

کرێکار دەتوانێت ڕووەك بچێنێت، بـەڵام ناتوانێـت بـە خـۆر بڵێـت: "ئـەم بەیانییە ڕەونەقدارتر بدرەوشێرەوە". ناتوانێـت بـە هـەورەکان بڵێـت: "ئـەم پـاش نیوەڕۆیـە ببـارێنن". دەبێـت ئـەوە بکـات، کـە پێویسـتە: زەوییەکـە بکێڵێت، تۆوەکە بچێنێت و لە ڕێگەی تێفکرانـەوە فێـری هونـەری ئـارامگرتن ببێت.

ئەو کاتەی بۆی دەردەکەوێت دانەوێڵەکەی وێران بووە و کارەکەی بۆ نەهاتۆتە بەرهەم، ئەزموونی ساتی نائومێدی دەکات. ئەو کەسەش، کە بەدووی خەونەکەی دەکەوێت لە بڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوە، ئەوجاش حەزدەکات بگەڕێتەوە و کارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، کە بتوانێت پێی بگوزەرێنێت.

هەرچۆنێك بێت، ئەو ڕۆژە دڵی هەموو کرێکارێك و هەموو سەرکەشێك پڕ لە خۆشی و بڕوا دەبێتەوە. هەردووکیان بەرهەمی بەخشینەکە دەبینن و شادمان دەبن. چونکە هەردووکیان هەمان گۆرانی دەچڕن: گۆرانی ئاسوودەیی ئەو کارەی کە بە بڕواوە پێیان بەخشراوە.

شاعیر لە برساندا دەمرێت ئەگەر لەو ناوچەیە شوانی لێ نەبێت. شوانەکە لە خەفەتدا دەمرێت ئەگەر نەتوانێت وشەکانی شاعیرەکە بەگۆرانی بچڕێت.

لە ڕێگەی بەخشینەوە ڕێگە بە خەڵکانی تر دەدەیت خۆشیان بوێیت. تۆش لە ڕێگەی ئەوەی بە خەڵکانی تری دەبەخشیت فێری خۆشەویستییان دەکەیت.

هەر هەمان ئەو پیاوەی لەبارەی کارەوە پرسیاری کرد، پرسیارێکی تریشی کرد:

"باشە بۆچی هەندێك کەس لەوانی تر بە بەختترن؟"

لەوەڵامدا گوتی:

***

سەرکەوتن بەوە بەدەست ناهێندرێت، کە کاری کەسێك لەلایەن کەسانی دیکەوە هەڵبسەنگێندرێت. ئەوە میوەی تۆوێکە، کە بە خۆشەویستییەوە ڕواندووتە.

کاتێك وەرزی دروێنە دێت، دەتوانیت بە خۆت بڵێیت: "سەرکەوتم".

تۆ لە بەدەستهێنانی ڕێز بۆ کارەکەی خۆت سەرکەوتنت بە دەستهێنا، چونکە تەنها بۆ گوزەرانت کارت نەکرد، بەڵکو بۆ ئەوەش کارت کرد، کە خۆشەویستیت بۆ خەڵکانی دیکە ئاشکرا بکەیت.

توانیت ئەوە تەواو بکەیت، کە دەستت پێی کردبوو، گەر چی تەنانەت پێشبینی هەموو ئەو داوانەی سەر ڕێگەکەشتت نەکردبوو. کاتێکیش پەرۆشیت لەبەرامبەر تەنگوچەڵەمە چاوەڕواننەکراوەکاندا کەمی کرد، بە دیسپلین گەیشتیت. کاتێکیش وا دەردەکەوت دیسپلین خۆی ون بکات لەبەر ماندوویيت، ساتی حەوانەوەت بۆ بیرکردنەوە لەو هەنگاوانە بەکاردەهێنا، کە پێویست بوو لە داهاتوودا بیاننێیت.

ئەو بەرەنگاریانە سستیان نەکردیت، کە ڕووبەڕووی ژیانی هەموو ئەوانە دەبێتەوە، کە مەترسی لە ئەستۆ دەگرن. دانەنیشتیت تا ئازار بەو شتانەوە بچێژیت، کە لەدەستت داون، لەبەرئەوەی بیرۆکەکەت بەکاریان نە هاتووە.

نەوەستایت کاتێك ئەزموونی ساتی شکۆمەندانەت کرد، چونکە هێشتا بە ئامانجەکەت نەگەیشتبوویت.

کاتێکیش بۆت دەرکەوت، کە دەبێت داوای یارمەتی بکەیت، هەستت بە زەبوونی نەکرد. کاتێکیش زانیت کەسێك پێویستی بە یارمەتییە، ئەوەی فێری ببوویت پیشانت دان بەبێ ئەوەی ترسی ئەوەت هەبێت، کە نهێنی ئاشکرا دەکەیت یان ئەو شتانە لەلایەن خەڵکی ترەوە بەکار بهێندرێن.

ئەوەی لە دەرگا دەدات، لێی دەکرێتەوە.

ئەوەی داوا دەکات، وەری دەگرێت.

ئەوەی دڵنەوایی دەکات، دەزانێ دڵنەوایی دەکرێتەوە.

ئەگەر هیچ کام لەم شتانەش ڕوویان نەدا لەکاتێکدا، کە چاوەڕوانیشیان دەکەیت، ئەوا زۆر ناخایەنێت، کە بەرهەمی ئەو شتە دەخۆیت، کە بەو بەخشندەییەوە لەگەڵ خەڵکانی تر بەشت کردووە.

سەرکەوتن دەچێتە لای ئەوانەی ئەوەی دەیکەن لەگەڵ کرداری خەڵکانی دیکە بەراوردی ناکەن؛ هەموو ڕۆژێك دەچێتە ماڵی ئەو کەسەوە، کە دەڵێت: "هەوڵی تەواوی خۆم دەدەم".

ئەوانەی تەنها بۆ سەرکەوتن دەگەڕێن بەدەگمەن پێی دەگەن، چونکە سەرکەوتن کۆتایی نییە، بەڵکو سەرەنجامە.

بە هیچ شێوەیەك خولیا یاریدەدەر نییە؛ تەنها لە نێوان هەڵبژاردنی ڕاڕەوەکاندا سەرمان لێ دەشێوێنێت و لە کۆتاییشدا وامان لێ دەکات خۆشیی ژیان هەڵبژێرین.

ئەو کەسەی کە گورزە ئاڵتوونێکی لەسەر یەك داندراوی هەیە بە قەبارەی گردەکەی باشووری شارەکەمان دەوڵەمەند نییە. دەوڵەمەندی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، کە لە هەموو ساتێکی بوونییدا پەیوەندی لەگەڵ وزەی خۆشەویستی هەیە.

دەبێت هەمیشە ئامانجێکت لە مێشکدا بێت، بەڵام لەگەڵ بەرەوڕوو بوونەوەیدا، تەماشاکردنی دیمەنەکەی دەوروپشتت هیچ نرخێکی ناوێت. لەگەڵ بەرەو پێشچوونی هەنگاو بە هەنگاوتدا، دەتوانیت کەمێك دوورتر ببینیت، لەبەر ئەوە هەلی دۆزینەوەی ئەو شتانە بدۆزەرەوە، کە پێشتر هەر تێبینیشت نەکردوون.

لەو ساتانەدا، گرنگە لە خۆت بپرسیت: "ئایا هێشتا نرخم هەر وەك خۆیەتی؟ ئایا هەوڵی شادمانکردنی کەسانی تر دەدەم و ئەوە دەکەم، کە لێم چاوەڕوان دەکەن، یان هەر بەڕاستی خۆم قایل کردووە بەوەی کە کارەکەم دەرکەوتەی ڕۆح و پەرۆشیمە؟ ئایا بە هەر نرخێك بێت سەرکەوتنم گەرەکە، یان دەمەوێت ببمە کەسێکی سەرکەوتوو، چونکە توانیومە ڕۆژەکانم پڕ لە خۆشەویستی بکەم؟"

چونکە ئەوە واتای ڕاستەقینەی خۆشەویستییە: دەوڵەمەندکردنی ژیانت، نەك پڕکردنی سندوقەکان بە ئاڵتوون.

ڕەنگە پیاوێک بڵێت: "پارەکەم بەکاردەهێنم بۆ تۆوکردن، چاندن، دروێنە و پڕکردنی گەنجینەکەم لە دانەوێڵە، بەو شێوەیەش لە هیچ شتێک کەمم نابێت". بەڵام کاتێك میوانە نەخوازراوەکە دەگات، هەموو ڕەنجەکانی پیاوەکە بەهەدەر دەڕۆن.

ئەوەی کە گوێی هەیە بۆ بیستن، لێگەڕێ با ببیستێ.

هەوڵ مەدە ڕێگەکە کورت بکەیتەوە، بەڵکو بە شێوەیەك گەشت بکە، کە هەر کردارێکت زەوییەکە بەپیت بکات و دیمەنە سروشتییەکە جوانتر بکات.

هەوڵ مەدە ببیتە مامۆستای کات. ئەگەر ئەو بەرهەمە بچنیت، کە دەمێك نییە چاندووتە، ئەوا سەوز دەبێت و خۆشی بە کەس نابەخشێت. ئەگەر بەبێ ترس و دڵنیایی بڕیار بدەیت، ساتی پێشکەشکردنەکە دوا بخەیت، ئەوا میوەکە دەگەنێت.

لەبەر ئەوە، ڕێز لە کاتی نێوان چاندن و دروێنە بگرە.

چاوەڕێی پەرجووی گۆڕین بکە.

هەتا دانەوێڵەکە نەکرێتە فڕنەکەوە، ناتوانرێت پێی بگوترێت نان.

هەتا وشەکان نەگوترێن، ناتوانرێت پێیان بگوترێت شیعر.

هەتا دەزووەکان بە دەستەکانی ئەو کەسە نەچندرێن، کە کاری لەسەر دەکات، ناتوانرێت پێی بگوترێت بەرگ.

***

کەی ئەو کاتە هات، کە بەخشیشەکەت پیشانی خەڵکی بدەیت، سەرسام دەبن و بە یەکدی دەڵێن: "ئەوە پیاوێکی سەرکەوتووە، چونکە هەموو کەس ئارەزووی بەرهەمی ڕەنجەکانی دەکات".

کەس پرسیاری نرخی بەرهەمەکە ناکات، چونکە ئەوانەی کاری خۆیان بە خۆشەویستییەوە دەکەن ئەفراندنیان بە گوڕ و تینێك پڕ دەکەن، کە چاو توانای بینینیی نییە. هەر بە شێوەی تەنافبازێك، کە بەبێ هیچ ڕەنجێکی دیار بە ئاسماندا بەسەرکەوتوویی دەڕوات و، کاتێکیش دێتەوە خوارێ، وەك سروشتیانەترین شتی جیهان دەبیندرێت.

لە هەمانکاتدا، ئەگەر کەسێك بوێریی پرسینی هەبێت، وەڵامەکە ئەمە دەبێت: بیرم لە کۆڵدان کردەوە، پێمەوابوو ئیدی خودا گوێم لێ ناگرێت، زۆرینەی کات دەبوو ئاڕاستە بگۆڕم، لە حاڵەتەکانی دیکەشدا ڕێگەکەم ون دەکرد. سەرەڕای هەموو شتێك، ڕاڕەوەکەمم دۆزییەوە و بەردەوام بووم، چونکە پێموابوو هیچ ڕێگەیەکی تر نییە، کە ژیانمی پێ بگوزەرێنم.

فێری ئەوە بووم کە دەبێت، کام پرد بپەڕێندرێتەوە و کام پرد بسووتێندرێت.

***

من شاعیر، جووتیار، هونەرمەند، سەرباز، باوك، بازرگان، فرۆشیار، مامۆستا، سیاسەتمەدار، دووربین و کەسێکم کە تەنها ئاگاداری ماڵ و منداڵم دەکەم.

ئاگاداری ئەوەم، کە چەندین خەڵکی لە من بە ناوبانگتر هەن و، زۆرینەی کاتیش بە تەواوەتی شایانین. بە شێوەیەك لە شێوەکان، تەنها دەرکەوتەیەکی لەخۆبایی بوون و پەرۆشییە و، بەرگەی تاقیکردنەوەی کات ناگرێت.

سەرکەوتن چییە؟

ئەوەیە، کە هەموو شەوێك بتوانیت بە ڕۆحێکی پڕ لە ئاشتییەوە بچیتە سەر جێگەی خەوەکەت.

ئەوجا ئەلمیرا، کە هێشتا پیێوابوو
سووپایەکی پڕ لە فریشتە لە
ئاسمانەکانەوە دێنە خوارێ بۆ پارێزگاریکردن
لە شارە پیرۆزەکە، گوتی:

"باسی پەرجوومان بۆ بکە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

پەرجوو چییە؟

دەتوانین بە چەند شێوەیەك پێناسەی بکەین: وەك شتێك، کە بەپێچەوانەی یاساکانی سروشت دەڕوات؛ ڕاسپاردەیەك لە ساتەکانی تەنگوچەڵەمەدا؛ چارەسەر و تارمایی؛ ڕووبەڕووبوونەوەی چاوەڕواننەکراوی مەحاڵ؛ یان وەك دەستتێوەردانی دوایین سات لەو کاتەدا، کە میوانە نەخوازراوەکە دەگات.

هەموو ئەو پێناسانە ڕاستن، بەڵام پەرجوو تەنانەت ئەوانەش تێدەپەڕێنێت: شتێکە، کە لەناکاو دڵمان پڕدەکات لە خۆشەویستی. کاتێکیش ئەوە ڕوودەدات، هەست بە ڕێزێکی زۆر دەکەین لە بەرامبەر ئەو بەرەکەتەدا، کە خودا پێی بەخشیوین.

ئەم ڕۆژەمان بدەرێ، خودایا، ڕۆژانەی پەرجووییمان.

گەر تەنانەت توانای تێبینیکردنیشیمان نەبێت، لەبەر ئەوەی مێشکمان جەنجاڵە و سەرنجمان لە کارێکی مەزندا چڕکردۆتەوە. گەر تەنانەت تەواو سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانە بین و بزانین، کە دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕاڕەوەکەمان.

کاتێکیش، کە غەمبار بووین، یارمەتیمان بدە چاوەکانمان بکەینەوە و ژیانی چواردەورمان ببینین: گەشانەوەی گوڵێك، ئەستێرەکانی ئاسمان، چڕینی گۆرانی دووری باڵندەیەك، یان دەنگی نزیکی منداڵێك.

یارمەتیمان بدە تێبگەین، کە شتگەلێکی گرنگ هەن و دەبێت بەبێ یارمەتی هیچ کەسێك بیاندۆزینەوە، هەستیش بە تەنیایی و بێ سوودی نەکەین، چونکە تۆ لەگەڵماندایت، ئامادەیت دەستمان بگریت، ئەگەر هات و پێمان کەوتە چاڵێکەوە.

یارمەتیمان بدە بەسەر ترسەکەماندا زاڵ ببین و بەرەو پێش بڕۆین و، ئەو شتانەش، کە ڕوون ناکرێنەوە بەبێ پێویستی لێکدانەوە و زانینی هەموو شتێك قبوڵ بکەین.

یارمەتیمان بدە تێبگەین، کە هێزی خۆشەویستی لە ناکۆکییدایە، مانەوەی خۆشەویستیش لەبەر ئەوەیە، کە دەگۆڕێت، نەك لەبەر ئەوەی کە هەر لە جێگەی خۆی دەمێنێتەوە و ڕووبەڕووی هیچ ململانێیەك نابێتەوە.

لەوەش تێبگەین، کە هەر جارێك بینیمان زەبوون زۆردار بوو و زۆردار زەبوون بوو، بزانین کە گەواهی پەرجوویەکمان داوە.

یارمەتیمان بدە تێبگەین لەوەی کاتێك قاچەکانمان ماندوو دەبن، لەبەر هێزی دڵمانە، کە دەتوانین لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بین، کاتێکیش دڵمان هیلاك دەبێت، هێشتا بەهۆی هێزی باوەڕمانەوە دەتوانین بەردەوام بین.

یارمەتیمان بدە لە بینینی هەر دەنکە لمێکی بیاباندا بەڵگەی پەرجووی جیاوازی ببینین، لەوەشەوە ئازایەتیمان بدەرێ خۆمان وەك خودی خۆمان قبوڵ بکەین. لەبەر ئەوەی هەر چۆن، کە دوو دەنکە لمێك لە یەکدی ناچن، ئا بەو شێوەیەش هیچ دوو مرۆڤێك وەك یەکدی بیر ناکەنەوە و کرداریان بە هەمان ڕێگە نابێت.

یارمەتیمان بدە بێ فیز بین کاتێك وەردەگرین و شادمان بین کاتێك دەبەخشین.

یارمەتیمان بدە تێبگەین لەوەی ژیری لەو وەڵامانەدا نییە، کە دەماندرێتەوە، بەڵکو لە نهێنی ئەو پرسیارانەدایە، کە ژیانمان دەوڵەمەند دەکەن.

یارمەتیمان بدە هەرگیز دیلی دەستی ئەو شتانە نەبین، کە پێمانوایە دەیانزانین، چونکە ئێمە زۆر کەم لەبارەی چارەنووسەوە دەزانین و، ڕەنگە ئەوەش بەرەو هەڵەنەکردن ڕابەریمان بکات، وامان لێ بکات لە چوار شتە سەرەکییە باشەکە سوودمەند ببین: ئازایەتی، کەشخەیی، خۆشەویستی و هاوڕێیەتی.

***

ئەم ڕۆژەمان بدەرێ، خودایا، ڕۆژانەی پەرجووییمان.

هەر چۆن چەندین ڕاڕەو هەیە بۆ گەیشتن بە لووتکەی چیایەك، ئاواش چەندین ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەمان. یارمەتیمان بدە ئەو ڕاڕەوە بدۆزینەوە، کە شایانی شوێنکەوتنە و خۆشەویستیشی تێدا دەدۆزرێتەوە.

یارمـەتیمان بـدە خۆشەویسـتییە خەوتووەکـەی نـاو خۆمـان بـەئاگا بهێنینەوە بەر لەوەی خۆشەویستی ناو خەڵکی ڕاچڵەکێنین. تـەنها ئـەو کاتـە دەتوانین خۆشەویستی، پەرۆشی و ڕێز بۆ خۆمان ڕابکێشین.

یارمەتیمان بدە جەنگەکانی خۆمان، ئەو جەنگانـەی کـە لـە دژی ویستی خۆمان ڕاکێشراوینەتە نـاوی و، ئـەو جەنگانـەی کـە نـاتوانین خۆمانیـان لـێ لابدەین، چونکە چارەنووس خستونیەتە ڕاڕەوەکەمان، جیابکەینەوە.

هیواخوازم چاوەکانمان بکرێنەوە تا ببینین، کە هیچ دوو ڕۆژێك لەیەکدی ناچن. هەر ڕۆژەو پەرجووی جیاوازی خۆی دەهێنێت، کە وامـان لـێ دەکات هەناسە بدەین، خەون ببینین و لەبەر خۆردا پیاسە بکەین.

هیواخـوازم گوێکانیشـمان بکرێنـەوە تـا ئـەو وشـە دژانـە ببیسـتین، کـە لەناکاو لە دەمی یەکێك لە هاوەڵەکانمدا دەردەپەڕێن، گەرچی تەنانـەت ئێمـە داوای ئامۆژگاری ئەومان نەکردووە و ناشـزانێت لـەو سـاتەدا چـی بـە ڕۆحـی ئێمەدا گوزەر دەکات.

کـاتێکیش دەممـان کـردەوە، هیواخـوازم تـەنها بـە زوبـانی مـرۆ قسـان نەکـەین، بـەڵکو بـە زمـانی فریشـتەش، بڵـێین: "پـەرجوو لـە دژی یاسـاکانی سروشـت ناخوڵقێـت؛ ئـەوە تـەنها ئێمـەین وا هەسـت دەکـەین، چـونکە لـە یاساکانی سروشت نازانین".

کـاتێکیش ئـەوەمان بـە دەسـتهێنا، هیواخـوازم بـەڕێزەوە سـەرمان بچەمێنینەوە و بڵێین: "من کـوێر بـووم، بـەڵام ئێسـتاکە دەبیـنم. لاڵ بـووم، بەڵام ئێستاکە دەپـەیقم. کـەڕ بـووم، بـەڵام ئێسـتا دەبیسـتم. چـونکە خـودا

پـەرجووی خـۆی لـەناو منـدا ئافرانـد و، هـەموو ئـەو شـتانەی پێموابـوون لەدەست چوون، گەڕانەوە".

***

پەرجوو دەمامکەکان دادەدڕێت و هـەموو شـتێك دەگۆڕێـت، بـەڵام ڕێگـە نادات بزانین چی لە پشتی دەمامکەکانەوەیە.

پەرجوو ڕێگە دەدات بەبێ ئازار لە دۆڵی سێبەری مـەرگ هـەڵبێین، بـەڵام پێمان ناڵێت کام ڕێگەیە بەرەو چیاکانی شادی و ڕووناکیمان دەبات.

ئەو دەرگایانە دەکاتەوە، کە قفڵی مەحاڵیان لـێ درابـوو، بـەڵام کلیـل بـۆ کردنەوەیان بەکارناهێنێت.

چـواردەوری خۆرەکـان بـە هەسـارە دەگرێـت تـا خۆرەکـان هەسـت بەتەنیایی نەکەن لە گەردووندا، لە هەمانکاتدا ڕێگەش نادات هەسارەکان زۆر نزیك ببنەوە تا خۆرەکان لەناویان نەبات.

بە کار دانەوێڵە دەگۆڕێت بە نان، بە ئارامی ترێ دەگۆڕێت بـە شـەراب و، مردن دەگۆڕێت بە ژیان لەڕێگەی خەونی زیندووبوونەوەوە.

لەبەر ئەوە، ئەم ڕۆژەمان بدەرێ، خودایا، ڕۆژانەی پەرجووییمان.

بشمانبەخشە ئەگەر هەمیشە توانای ناسینەوەیمان نەبوو.

ئەوجا پیاوێك، کە گوێی بۆ دەنگی جەنگەکە
دەگرت، کە لە پشتی دیوارەکانی
شارەکەوە دەهات و ترسی
خێزانەکەی هەبوو، گوتی:

"باسی نیگەرانیمان بۆ بکە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

هیچ هەڵەیەك لە نیگەرانیدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین کاتی خودا زەوت بکەین، ئەویش بەشێکە لە مەرجی مرۆڤ، کە دەیەوێت چەندە بەخێرایی بتوانێت ئەو شتەی کە دەیەوێت وەریبگرێت.

یان بەڕێیی بکەین ئەگەر بووە هۆی ترسمان.

ئەمە ئیدی لە منداڵییەوە دەست پێ دەکات، هەتا دەگاتە ئەو کاتەی دەگەینە ئەو تەمەنەی کە ئێمە جیاوازیمان لەگەڵ ژیان نابێت. چونکە چەندێك بەتووندی بە ساتی ئێستاوە گرێ بدرێین، ئەوا هەمیشە بە نیگەرانی چاوەڕوانی کەسێك، یان شتێك دەبین.

چۆن دەتوانیت بە دڵێکی بەسۆز بڵێیت هێمن بێت و بەبێ دەنگی و دوور لە پەشۆکان و ترس و پرسیارە بێ وەڵامەکان لە پەرجووەکانی ئەفراندن ڕابمێنێت؟

نیگەرانی بەشێکە لە خۆشەویستی، لەبەر ئەوەش نابێت سەرزەنشتی بکرێت.

چۆن دەتوانیت بە کەسێک بڵێیت نیگەران نەبێت لە کاتێکدا لە خەونی خۆیدا پارە و ژیانی خۆی دابین کردووە و بەڵام هێشتا هیچ ئەنجامێکی نەبینیووە؟ جووتیار ناتوانێت زنجیرەی وەرزەکان خێرا بکات تا بەری ئەو دارە بخوات، کە چاندوویەتی، بەڵکو بە نائارامی چاوەڕێ دەکات تا وەرزی دروێنە و پایز دەگات.

ئایا چۆن دەتوانیت داوا لە جەنگاوەرێك بکەیت بەر لە جەنگێك هەست بە نیگەرانی نەکات؟

تا ئەم ساتە و هەتا ڕادەی شەکەتبوون مەشقی کردووە، باشترین هەولی خۆی داوە و، هەروەها لەو بڕوایەشدایە کە ئامادەیە و دەشترسێت، کە ڕەنگە هەموو ڕەنجەکانی بەهەدەر بڕوات.

نیگەرانیش هەر لەگەڵ لە دایکبوونی مرۆڤدا چاوی بە ژیان هەڵهێنا. لەبەر ئەوەش، کە ناتوانین بەسەریدا زاڵ ببین، دەبێت فێر ببین لەگەڵیدا بژین — هەر وەك چۆن فێربووین لەگەڵ لافاودا هەڵبکەین.

***

ئەوانەی کە ناتوانن فێری بن، ژیان بۆیان دەبێتە کابووسێك.

ئەو شتەی کە دەبێت زۆر پێی شادمان بن — لە هەموو ئەو کاتژمێرانەدا، کە ڕۆژێك دروست دەکەن — دەبێتە نەفرینێك. دەیانەوێت کات خێرا تێبپەڕێت، نازانن ئەمە واش دەکات زووتر بە میوانە نەخوازراوەکە ئاشنا بن.

تەنانەت لەوەش خراپتر، لە هەولیاندا بۆ وەلانانی نیگەرانی، شتگەلێك دەکەن، کە زیاتر نیگەرانیان دەکات.

ئەو دایکەی کە چاوەڕوانە منداڵەکەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، دەست بە وێناکردنی خراپترین شت دەکات.

عاشق بەم شێوەیە بیر دەکاتەوە: "خۆشەویستەکەم هی منە و منیش هی ئەوم. لە ڕێگە فراوانەکاندا بەدوویدا گەڕام، بەڵام نەمدۆزییەوە". لەگەڵ ڕەتبوون لە هەر کونجێك و پرسیارکردن لە هەر کەسێك، کە ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە، ڕێگە بە نیگەرانیی ئاسایی خۆشەویستی دەدەم ببێتە هیوابڕاوی.

ئەو کرێکارەی کە چاوەڕوانی خواردنی بەرهەمی ڕەنجەکانیەتی، هەوڵ دەدات خۆی بە کرداری دیکە پڕ بکاتەوە، کە هەر یەکێك لەو فەرمانانە لە ساتی زیاتری چاوەڕوانی نزیکی دەکەنەوە. زۆر ناخایەنێت، کە هەر تاکە نیگەرانییەك لەگەڵ یەکێکی دیکە کۆدەبێتەوە و دەبنە نیگەرانییەکی گەورە، بەو شێوەیەش وای لێ دێت کە ئیدی ناتوانێت ئاسمان و ئەستێرەکان و منداڵەکانی ببینێت، کە یاری دەکەن.

بەو شێوەیەش دایك و عاشق و کرێکار، هەموو لە گوزەرانی ژیانیان دەوەستن و زۆر بەسادەیی پێشبینی خراپترین دەکەن؛ گوێ لە دەنگۆ دەگرن و سکاڵای ئەوە دەکەن، کە ڕۆژەکان ناکۆتا دەردەکەون. دەبنە دەست درێژ بەسەر هاوڕێ و خێزان و فەرمانبەرەکانەوە. بە خراپی نان دەخۆن، ئیتر ئەگەر نانخواردنێکی زۆر بێت، یان هەر نەتوانن هیچ شتێك بە قوڕگیاندا بەرنە خوارێ. لە شەویشدا سەریان دەخەنە سەر سەرینەکانیان، بەڵام ناتوانن بخەون.

لەو حاڵەتەشدا نیگەرانی پەچەیەک دەچنێت، کە تەنها چاوەکانی ڕۆح لێوەی دەبینن.

ماندوویش چاوەکانی ڕۆحی لەئاست بینیندا لێڵ کردووە.

لەو خاڵەشدا، یەکێک لە خراپترین دوژمنەکانی مرۆڤایەتی خۆی دەردەخات: ڕاڕایی.

ڕاڕایی دەگات و دەڵێت:

"ئێستا چارەنووست هی منە. وات لێ دەکەم چاو بۆ ئەو شتانە بگێڕیت، کە بوونیان نییە.

"شادی ژیانیشت هی منە. لە ئێستا بەدواوە، دڵت ئاشتی ناناسێت، چونکە پەرۆشی دەکەمە دەرەوە و جێگەکەی دەگرمەوە.

"وا دەکەم ترس لە جیهاندا بڵاو ببێتەوە، واش لە تۆ دەکەم، کە بترسیت، بەبێ ئەوەی بزانیت بۆ. پێویست ناکات بزانیت بۆ، تەنها پێویستە بە ترساوی بمێنیتەوە و بەو شێوەیەش ترس تێر بکەیت.

"کارەکەشت، کە جارێک لە جاران بەخشیش بووە، من دەیبەم بۆ خۆم. خەڵکانی دیکە دەڵێن، کە تۆ بوویت بە نموونە، چونکە زۆر خۆت ماندوو کردووە و، تۆش بەدەم سکاڵاکەیانەوە پێدەکەنیت و سوپاسیان دەکەیت.

"بەڵام لە دڵتدا، من پێت دەڵێم، کە کارەکەت بووە بە هی من و بۆ دوورخستنەوەت لە هەموو شتێک و هەموو کەسێک بەکاری دەهێنم — لە هاوڕێکانت، لە کوڕەکەت، لە خۆت.

"گرانتر کار بکە و بەو شێوەیەش پێویست ناکات بیر بکەیتەوە. لەوە گرانتر کار بکە، کە پێویستتە، بەو شێوەیەش دەتوانیت هەموو گوزەران پێکەوە بووەستێنیت.

"خۆشەوەیستییەکەشت، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرکەوتەیەکی وزەی پیرۆز بوو، ئێستاکە هی منە. ئەو کەسەش، کە خۆشت دەوێت ناتوانێت بۆ ساتێکیش بەجێت بهێڵێت، چونکە لە دڵتدا دەڵێم: "وریابە، ڕەنگە بڕوات و هەرگیز نەگەڕێتەوە".

"کوڕەکەشت، کە جارێك لە جاران پارەوی خۆی لە جیهاندا گرتۆتە بەر، ئێستاکە هی منە. دڵی پڕ لە نیگەرانی ناپێویست دەکەم تا وای لێ بێت تامی سەرکەشی و مەترسی نەکات، تا وای لێ بکات هەست بە ئازار بکات هەر کات ناشادمانی کردیت و هەستێکی تاوانباری لە دڵدا بەجێ بمێنێت، کە نەیتوانیوە بە پێی بۆچوونەکانی تۆ بژی".

***

لەبەر ئەوە، نیگەرانیش بەشێکە لە ژیان، هەرگیز ڕێگە مەدە دەستت بەسەردا بگرێت.

ئەگەر لێت نزیك کەوتەوە، بڵێ: "من نیگەرانی سبەی نیم، چونکە خودا لەوێیە و چاوەڕوانی من دەکات".

ئەگەر هەوڵی دا قایلت بکات، کە کردنی چەندین کار ژیانێکی بە بەرهەمت پێ دەبەخشێت، بڵێ: "پێویستم بە کاتە بۆ تەماشاکردنی ئەستێرەکان تا هەست بە سروشت بکەم و بتوانم کارەکەی خۆم بەباشی ئەنجام بدەم".

ئەگەر بە تارمایی برسێتی تۆی ترساند، بڵێ: "مرۆڤ تەنها بە نان ناژی، بەڵکو بە هەر یەك لەو وشانە دەژی، کە لە دەمی خودا دێنە دەرێ".

ئەگەر پێی گوتیت ڕەنگە خۆشەویستەکەت نەگەڕێتەوە، بڵێ: "خۆشەویستەکەم منە و منیش ئەوم. بە ڕووبار شوانیی ڕانەکەی دەکات و لە دووریشەوە هەر گوێم لە گۆرانی چرپینەکەیەتی. کاتێکیش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ماندوو و شادمان دەبێت، منیش خواردنێکی بۆ دروست دەکەم و تەماشای خەوتنەکەی دەکەم".

ئەگەر گوتی کورەکەت ڕێز بۆ ئەو خۆشەویستییە دانانێت، کە پێت بەخشیووە، لەوەڵامدا بڵێ: "وریایی لە ڕادە بەدەر ڕۆح و دڵ وێران دەکات، چونکە ژیان کرداری ئازایەتییە و، کرداری ئازایەتییش هەمیشە کرداری خۆشەویستییە".

بەو شێوەیە نیگەرانی لە کەناردا وەلا دەنێیت.

نیگەرانی ون نابێت، بەڵام ژیریی مەزنی ژیان فێرمان دەکات، کە دەتوانین ئەو شتانە زەوت بکەین، کە دەیانەوێت بمانکەنە کۆیلەی خۆیان.

ئەوجا پیاوێکی گەنج گوتی:

"پێمان بڵێ داهاتوو چی لە خۆ گرتووە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

هـەموومان دەزانـین چـی لـە داهـاتوودا چاوەڕوانمان دەكـات: میوانـە نەخوازراوەكە، كە دەشێت لە هەر كاتژمێرێكدا بـەبێ ئاگاداركردنـەوە بێـت و دەڵێت: "وەرە لەگەڵم".

چەندێكیش لێـی نـاڕازی بـین، هـیچ هەڵبژاردەیـەكی ترمـان لەبەردەسـتدا نییە. ئەوجا لەو ساتەدا، شادییە مەزنەكەمان، یان غەمبارییـە بەسوێكەمان، ئـاوڕ بـۆ ڕابـردوو دەداتـەوە و وەڵامـی پرسـیارەكە دەداتـەوە: "ئایـا خۆشەویستی تەواوم بەخشی؟"

دەبێت خۆشەویستی ببەخشین. من تەنها باسـی خۆشەویسـتی كەسـێكی دیكە ناكەم. خۆشەویستی واتە كرانەوە بـۆ پـەرجووەكان، سـەركەوتنەكان و بەزینەكان، بۆ هـەموو شـتێك كـە ڕۆژانـە ڕوودەدەن، كـە وامـان لـێ دەكـەن بەسەر ڕووكاری زەوییدا هەنگاو بنێین.

چـوار هێـزی نەبینـدراو فـەرمانڕەوایی ڕۆحمـان دەكـەن: خۆشەویسـتی، مەرگ، دەسەڵات و كات.

دەبێت خۆشەویستی ببەخشین، چونكە خودا خۆشی دەوێین.

دەبێت ئاگاداری میوانە نەخوازراوەکە بین، ئەگەر بە تەواوەتی لە ژیان تێگەیشتبین.

دەبێت لە پێناوی گەشەکردندا ململانێ بکەین، بەڵام بەبێ کەوتنە داوی ئەوەی کە ڕەنگە چ دەسەڵاتێکمان لەوە دەست بکەوێت. ئێمە دەزانین، کە دەسەڵاتی لەو شێوەیە بێ نرخە.

لە کۆتاییشدا، دەبێت ئەوە قبوڵ بکەین، کە ئەگەر چی ڕۆحیشمان نەمرە، بەڵام لەم ساتەدا بە هەموو گونجان و سنوورەکانییەوە لە تۆڕی کاتدا گیراوە.

خەونەکەمان، ئەو خواستەی لە ڕۆحماندایە، لە هیچ کوێوە پەیدا نەبووە. کەسێك لەوێی داناوە. ئەو کەسەش، کە خۆشەویستییەکی پاکژە و تەنها شادمانی ئێمەی گەرەکە، تەنها لەبەر ئەوە وای کردووە، چونکە کەرەستەی دەرك پێکردنی خەونەکانمان و خواستەکانمانی پێ بەخشیوین.

کاتێك بە ناو کاتی پڕ لە تەنگوچەڵەمەدا گوزەرت کرد، لەیادت بێت: ڕەنگە جەنگێکی سەرەکیت دۆڕاندبێت، بەڵام ڕزگارت بووە و هێشتا لێرەیت.

ئەوە سەرکەوتنە. شادمانی خۆت دەربڕە و ئاهەنگ بۆ توانات بگێڕە، تا بەرەو پێش بچیت.

بەخشندانە خۆشەویستیت بەسەر خاك و کێڵگەکاندا، بەسەر شەقامەکانی شارە گەورەکە و گردەبا و بیابانەکەدا بپرژێنە.

پیشانی بدە، کە خەم لە هەژاران دەخۆیت، بەو شێوەیەش بواری ئەوەیان پێ دەبەخشیت، کە چاکەی خێرخوازییان پیشان بدەیت.

بەزەییشت بەو دەوڵەمەندانەدا بێتەوە، کە بڕوا بە هیچ شتێك و هیچ کەسێك ناکەن، گەنجینەکەیان پڕ لە دانەوێڵە و سندوقەکانیان پڕ لە خەرجی دەکەن، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانەش، ناتوانن خۆیان لە تەنیایی ڕزگار بکەن.

هەرگیز هەلی دەرخستنی خۆشەویستی لەدەست مەدە، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە لێت نزیکن، چونکە ئێمە هەمیشە وریای ئەوەین، کە ئازاریان نەدەین.

خەڵکیت خۆش بوێت — چونکە خۆت یەکەم کەس دەبیت، کە قازانج لەوە بکەیت. جیهانی چوار دەورت خەڵاتت دەکەن، گەر تەنانەت یەکەمجار بە خۆشت بڵێیت: "ئەوان لە خۆشەویستییەکەم تێناگەن".

خۆشەویستی پێویستی بە تێگەیشتن نییە. پێویستی بە پیشاندانە. لەبەر ئەوە، ئەوەی داهاتوو لە خۆی گرتووە، بەتەواوەتی دەکەوێتە سەر توانای خۆشەویستیت.

بۆ ئەو مەبەستەش، دەبێت بڕوای تەواوت بەوە هەبێت، کە ئەنجامی دەدەیت. ڕێگە مەدە خەڵکانی تر بڵێن: "ئەو ڕێگەیە باشترە". یان "ئەو ڕێگەیە ئاسانترە".

گەورەترین دیاری کە خودا پێیی بەخشیووین، هێزی بڕیاردانە.

ئێمە هەموومان لە منداڵییەوە پێمان وتراوە ئەوەی کە دەمانەوێت مەحاڵە. بەڵام لەگەڵ تێپەڕاندنی ساڵدا، کینە و ترس و تاوانیش تێدەپەڕێنین.

خۆت لەوە ئازاد بکە. سبەی نا، ئەمشەو نا، بەڵکو ئێستا.

وەکو گوتم: زۆرینەمان لەو باوەڕەداین ئەگەر بە ناوی خەونەکانمانەوە هەموو شتێك لە پشتەوە بەجێ بهێڵین ئەو کەسانە ئازار دەدەین، کە خۆشمان دەوێن.

بەڵام ئەوانەی کە بەڕاستی باشی ئێمەیان دەوێت دەیانەوێت شادمان بین، گەر تەنانەت لەوەش تێنەگەن، کە ئەنجامی دەدەین و، گەر تەنانەت لە یەکەم جاریشدا بە ناوی ترس و بەڵێن و فرمێسکەوە هەوڵی وەستانی بەرەوپێش چوونمان بدەن.

پێویستە سەرکەشی ئەو ڕۆژانەی کە دێن لە ڕۆمانسیەت پڕ بکرێن، چونکە جیهان پێویستی بەوەیە؛ لەبەر ئەوە، کاتێك سواری زینی ئەسپەکەت بوویت، هەست بەو هەوایە بکە، کە لە دەموچاوت دەدات و کەیف لەو هەستی ئازادییە وەربگرە.

بەڵام لەیادی مەکە، کە گەشتێکی درێژت لەبەردەمە. ئەگەر بەتەواوەتی خۆت بۆ ڕۆمانسیەتی ئەوە بەدەستەوە بدەیت، ڕەنگە بکەویت. ئەگەر جار بە جار نەوەستیت تا خۆشت و ئەسپەکەشت بحەوێنەوە، ئەوا ڕەنگە ئەسپەکەت لە تینوودا یان لەبەر شەکەتی بمرێت.

گوێ لە –با–کە بگرە، بەڵام ئەسپەکەت لەیاد مەکە.

هەر کاتیش شتەکان باش دەرکەوتن و خەونەکەت لە بەدیهاتندا بوو، دەبێت لە هەموو کاتێك ئاگادارتر بیت. چونکە هەر کات خەریکبوو خەونەکەت بەدی بێت، ڕەنگە تووشی هەڵەیەکی قێزەون ببیت.

دەبینیت خەریکە بگەیتە شوێنێك، کە پێشتر چەند کەسێکی کەم پێیان تێخستووە، پێشت وا دەبێت شایانی ئەو شتانە نەبیت، کە ژیان پێتدەبەخشێت.

تەواوی ئەو کۆستانەی کە هاتوونەتە ڕێگەت و هەموو ناخۆشییەکان و قوربانییەکانت لەیاد دەچێت. لەبەر ئەو هەستی تاوانبارییەش، دەشێت نائاگایانە تەواوی ئەو شتانە وێران بکەیت، کە ماوەیەکی زۆرت پێ چووە بۆ دروستکردنیان.

ئەوە ترسناکترین کۆستە، چونکە دەستبەرداربوونی سەرکەوتن پرشنیگییەکی پیرۆزی تێدایە.

بەڵام ئەگەر کەسێك لەوە تێبگات، کە شایانی ئەوەیە بۆ ماوەیەکی درێژ ململانێی لەپێناودا کردووە، بۆی دەردەکەوێت، کە بە تەنیا بەو شوێنە نەگەیشتووە و دەبێت ڕێز لەو دەستە بگرێت، کە ڕابەری کردووە.

تەنها ئەو کەسەی توانای شانازیکردنی هەیە بە هەر هەنگاوێکییەوە، کە دەینێت دەتوانێت لە نرخی خۆی تێبگات.

ئەوجا پیاوێك، كە خوێندەواری دەزانی و
شێتگیرانە هەوڵی نووسینی هەر شتێكی دەدا
كە قبتبییەكە دەیگوت، بۆ حەوانەوە وەستا،
هەستی دەكرد، كە لە جۆرە غەیبوبەیەكدایە.
گۆڕەپانەكە، دەموچاوە ماندووەكان،
پیاوە ئاینییەكان، كە بەبێ دەنگی گوێیان دەگرت
هەموویان لە بەشی خەوتنێك دەچوون.

ئەوجا تا بۆ خۆی بسەلمێنێت ئەوەی كە
ئەزموونی دەكات ڕاستییە،
پرسی:

"باسی دڵسۆزیمان بۆ بكە".

لەوەڵامدا گوتی:

***

دەشێت دڵسۆزی لەگەڵ دوکانێکدا بەراورد بکرێت، کە گوڵدانی گەورەی جوانکاری دەفرۆشێت، دوکانێك، کە خۆشەویستی کلیلەکەی پێ بەخشیوین.

هەر یەکێك لەو گوڵدانانە جوانن، چونکە جیاوازن، وەك هەموو کەسێك، هەموو دڵۆپە بارانێك، هەموو بەردێك، کە لە تەنیشت چیایەك دەخزێتە خوارێ.

هەندێکجار، بەهۆی تەمەن، یان هەندێك کەموکوڕی دەرك پێ نەکراوەوە، ڕەفەیەك لار دەبێت و دەکەوێت. خاوەنی دوکانەکەش بە خۆی دەڵێت: "ساڵەهایەکم لە تەمەن و خۆشەویستی خۆم تەرخان کرد بۆ کۆکردنەوەی ئەمانە، بەڵام گوڵدانەکان خیانەتیان لێ کردم و شکان".

پیاوەکە دوکانەکەی دەفرۆشێت و دەڕوات. دەبێتە کەسێکی تاڵ و گۆشەگیر، پێیوادەبێت، کە ئیدی بڕوا بە هیچ کەسێك ناکات.

ڕاستە هەندێك گوڵدان دەشکێن - بەڵێنێکی دڵسۆزی دەشکێت. لەو حاڵەتەدا، باشترین شت ئەوەیە پارچەکان کۆبکەیتەوە و ڕێیان بدەیت، چونکە ئەوەی کە دەشکێت هەرگیز وەك خۆی لێ نایەتەوە.

بەڵام هەندێکجار هۆکاری لاربوون و کەوتنی ڕەفەیەک بە تەواوەتی لە پشتی مەبەست و ئامانجی مرۆڤەوەیە: ڕەنگە هۆکارەکەی زەمینلەرزە، داگیرکردنی دوژمن، یان هەڵەشەیی کەسێک بێت، کە دێتە ناو دوکانەکەوە و تەنها چاو بۆ ئەو شوێنە دەگێڕێت، کە دەیەوێت بۆی بچێت.

ژنان و پیاوان سەرزەنشتی یەکدی دەکەن بۆ ڕوودانی ئەو کارەساتە. دەڵێن: "دەبوو کەسێک پێشبینی ڕوودانی ئەوەی بکردبا". یان: "ئەگەر من ئاگاداری ئەو شوێنەم بکردبا، نەمدەهێشت ئەو کێشانە ڕووبدەن".

هیچ شتێک هێندەی ئەوە لە ڕاستییەوە دوور نییە. ئێمە هەموومان دیلی دەستی دەنکەکانی کاتین، ناشتوانین دەستیان بەسەردا بگرین.

کات تێدەپەڕێت و ڕەفە کەوتووەکەش چاک دەکرێتەوە.

ئەو گوڵدانانەی دیکە، کە لە جیهاندا بۆ جێگەی خۆیان دەجەنگن لەوێ دادەنرێن. دوکاندارە نوێکە، کە تێدەگات لەوەی هیچ شتێک هەمیشەیی نییە، خەندە دەکات و بە خۆی دەڵێت: "ئەو تراژیدیایە هەلێکی بۆم ڕەخساند و منیش هەوڵ دەدەم باشترین سوودی لێ وەربگرم. کاری وەهای هونەر دەدۆزمەوە، کە هەرگیز پێموانەبووە بوونیان هەبووبێت".

جوانی دوکانی فرۆشتنی گوڵدانی جوانکارییەکە لە هەر گوڵدانێکدا بە نایابی دیارە، بەڵام کاتێک گوڵدانەکان بە تەنیشت یەکدییەوە دادەندرێن، ڕێکییەک دەخولقێنێت، کە پەرچی کاری دروستکەر و نیگارکێشەکە دەداتەوە.

دەشێت هەر کارێکی هونەری بە سادەیی بڵێ: "دەمەوێت تێبینی بکرێم و لێرە دەرۆمە دەرەوە". بەڵام ئەو ساتەی دەیەوێت ئەوە بکات، دەبێتە کۆمەڵێك پارچەی شکاو، کە هیچ نرخێکی نابێت.

هەر چۆن بۆ گوڵدان بەو شێوەیەیە، بۆ ژن و پیاوانیش هەر هەمان شتە.

کاتێك لەمە تێدەگەین، لە کۆتایی ڕۆژەکەدا بە تەنیشت دراوسێکەمانەوە دادەنیشین و بەڕێزەوە گوێ لەوە دەگرین، کە دەیەوێت بیلێت و ئەوە دەڵێین، کە پێویستە بیبیستێت. کەسیشمان هەوڵ نادەین فیکرەی خۆمان بەسەر ئەوی تردا بسەپێنین.

لە پشتی ئەو چیایانەوە، کە هۆزەکان لێك جیا دەکەنەوە، لە پشتی ئەو دوورییەوە، کە جەستەکان لێك جیا دەکاتەوە، کۆمەڵگەی ڕۆحەکان بوونی هەیە. ئێمەش بەشێکین لەو کۆمەڵگەیە، لەو کۆمەڵگەیەدا شەقامگەلێك نییە تا خەڵکی بە گوتنی وشەگەلێکی بێ حیکمەتەوە بەسەریدا گوزەر بکەن، تەنها ئەو ڕاڕەوانە بوونیان هەیە، کە شتە دوورەکان پێکەوە گرێ دەداتەوە و هەندێکجار پێویستە لەو زیانە چاك بکرێتەوە، کە بەبۆنەی کاتەوە لێی کەوتووە.

لەبەر ئەوە، ئەو عاشقەی دەگەڕێتەوە هەرگیز بێ بڕوا نابێ، چونکە دڵسۆزی هاوەڵی هەر هەنگاوێکی دەکات.

ئەو پیاوەش، کە دوێنێ وەك دوژمن دەبیندرا، چونکە جەنگێك هەڵگیرسابوو، ئەمڕۆ هاوڕێیە لەبەر ئەوەی جەنگ کۆتایی پێ هاتووە و ژیان بەردەوامە.

ئەو کورەی کە رۆیشتووە دەگەرێتەوە، بەڵام گەرانەوەکەی بە دەوڵەمەندبوونی هەموو ئەو ئەزموونانەیە، کە لە رێگەکەیدا فێریان بووە. باوکی بە باسکی کراوەوە لە ئامێزی دەگرێت و بە خزمەتکارەکانی دەڵێت: "باشترین رۆبی بۆ بێنن و ئەنگوستیلەیەك لە پەنجەی بکەن و سەندەڵ بکەنە پێکانی؛ چونکە کورەکەم مردبوو و ئێستا دووبارە زیندوو بووەتەوە. ون ببوو و ئێستا دۆزراوەتەوە".

ئەوجا پیاوێك، کە برۆکانی کات نیشانەی کردبوو و جەستەی ئەو برینانە نیشانەی کردبوو، کە چیرۆکی ئەو جەنگانەی دەگێڕایەوە، کە بەشداری تێدا کردبوو، گوتی:

"باسی ئەو چەکانەمان بۆ بکە، کە دەبێت لە کاتی لە دەستدانی هەموو شتێکدا بەکاری بهێنین".

لەوەڵامدا گوتی:

***

لە هەر شوێنێك دڵسۆزی هەبوو، چەك بەكار نایەت.

هەموو جۆرە چەكەكان ئامێری كەسانی نەگریسن، چونكە ئامێری مرۆڤی ژیر نین.

ڕەگی دڵسۆزی لە ڕێزدایە و ڕێزیش میوەی خۆشەویستییە، خۆشەویستیش ئەهریمەنەكانی ئەندێشە دەكاتە دەرەوە -كە بڕوا بە هیچ شتێك و هیچ كەسێك ناكات- لەجێی ئەوەش پاكژی بۆ سەرنجمان دەگێڕێتەوە.

كاتێك مرۆڤێكی ژیر دەیەوێت كەسێك لاواز بكات، یەكەمجار باوەڕ بەو كەسە دەهێنێت، كە خۆی بەهێزە. كەسەكەی دیكەش دەكەوێتە داوی بەرەنگاری كەسێكەوە، كە زۆر بەهێزترە و دەڕوخێت.

كاتێك مرۆڤێكی زیرەك دەیەوێت كەسێك نزم بكاتەوە، یەكەمجار وا لەو كەسە دەكات بە بەرزترین چیای جیهاندا سەربكەوێت تا سەراوی ئەوەی لا دروست بكات، كە زۆر بەهێزە. كەسەكەی دیكەش پێی وا دەبێت، كە ئەو هێشتا دەتوانێت بەرزتر بڕوات و خۆی لە چاڵەكەدا نوقوم بكات.

کاتێك مرۆڤێکی ژیر ئارەزووی شتێك دەکات، کە هی کەسێکی ترە، کۆمەڵێك شت و دیاری پێ دەبەخشێت. کەسەکەی دیکە هێندە شتی بێ سوودی لەبەردەستدا دەبێت، کە وای لێ دێت هەموو شتێکی تر لەدەست بدات، چونکە هێندە سەرقاڵە ناتوانێت شتەکانی خۆی بپارێزێت.

کاتێك مرۆڤێکی زیرەك بۆی نادۆزرێتەوە ڕکابەرەکەی پلانی چی دادەنێت، هێرشێك دەبات. ئێمە هەمیشە ئامادەین بەرگری لە خۆمان بکەین، چونکە هەموومان بە ترس و هەستی ئەوەوە دەژین، کە کەسی بەرامبەر خۆشی نەوێین.

ڕکابەرەکەی -ئەگەر هەرچەندەش زرنگ بێت- پارێزراو نییە و لەبەرامبەر ئەو تووڕەییەیدا کاردانەوەیەکی لەڕادەبەدەر توندوتیژی دەبێت. بۆ ئەو مەبەستەش، ئەو چەکانە دەردەخات کە پێیەتی، بەو شێوەیەش پیاوە زاناکە بۆی دەردەکەوێت خاڵی بەهێزی و لاوازی ئەو چییە. ئەوجا، بەپێی کاردانەوەی چاوەڕوانکراو، مرۆڤە زاناکە دەزانێت هێرش بەرێت یان بکشێتەوە.

ئا بەم شێوەیە ئەوانەی کە خۆبەدەستەوەدەر و زوو بەزیو دەردەکەون، ئەو کەسانە دەبەزێنن، کە بەهێز و بەدەسەڵاتن.

***

هەندێکجار مرۆڤی زرنگ جەنگاوەر دەبەزێنێت، بەڵام جەنگاوەریش مرۆڤی زانا دەبەزێنێت. بۆ خۆلادان لەمە، وا باشە بەدووی ئەو ئاشتی و هێمنییەدا بگەڕێیت، کە بە جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکاندا بوونیان هەیە.

پێویستە کەسی بریندار لە خۆی بپرسێت: "ئایا دڵ پڕکردن لە کینە و هەڵگرتنی ئەو بارە قورسە لەگەڵ خۆمدا نرخی هەیە؟"

بەو شێوەیەش سوود لە جۆرایەتی خۆشەویستی کەسێك وەردەگرێت - بەناوی بەخشینەوە. ئەمە یارمەتی دەدات لە هەموو ئەو ڕوسیاکردنانە بەرزی بکاتەوە، کە لە تینی جەنگدا گوتراون، ڕسواکردنی ئەو کاتە هەر زوو دەسڕدرێتەوە، هەر وەکو چۆن شنە با جێ پێ لەسەر لمی بیابانەکان دەسڕێتەوە.

کاتێك دەبەخشیت، ئەو کەسەی ڕوسیای کردوویت هەست بە زەبوونی و شەرمەزاری دەکات لەبەرامبەر هەڵەکانیدا و دەبێتە کەسێکی دڵسۆز.

لەبەر ئەوە، با ئاگاداری ئەو هێزانە بین، کە دەمانجووڵێنن.

پاڵەوانی ڕاستەقینە ئەو کەسە نییە، کە بۆ کاری مەزن لەدایك بووە، بەڵکو ئەو کەسەیە، کە توانیویەتی لە چەندین شتی بچوك قەڵغانێك لە دڵسۆزی بە چواردەوری خۆیدا دروست بکات.

بەو شێوەیەش، کاتێك ڕکابەرەکەی لە مەرگ، یان لە خیانەت ڕزگار دەکات، ئاماژە و جووڵەکەی هەرگیز لەیاد ناکرێت.

خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەو کەسە نییە کە دەڵێ: "پێویستە بە تەنیشتمەوە بیت و منیش ئاگاداریت دەکەم، چونکە ئێمە دڵسۆزی یەکدین". بەڵکو ئەو کەسەیە، کە تێدەگات دڵسۆزی دەبێت دەست لە دەستی ئازادی بڕوات. و بەبێ ترس و خیانەت، خەونی کەسی بەرامبەر قبوڵ دەکات و ڕێزی دەگرێت، بڕوا بە هێزی گەورەتری خۆشەویستی دەکات.

هاوڕێی ڕاستەقینە ئەو کەسە نییە، کە دەڵێت: "ئەمڕۆ تۆ بریندارت کردم و منیش غەمبارم".

دەڵێت: "ئەمڕۆ بریندارت کردم لەبەر هۆکارگەلێك، کە من لێیان زانا نیم و بۆ تۆش هەر بە هەمان شێوەیە، بەڵام دەزانم، کە سبەی دەتوانم پشت بە یارمەتی تۆ ببەستم. لەبەر ئەوەش غەمبار نابم".

هاوڕێکەش وەڵام دەداتەوە: "تۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزیت، چونکە ئەوەت گوت، کە هەستت پێی کرد. هیچ شتێك لە هاوڕێیەك خراپتر نییە، کە بە قبوڵکردنی هەموو هەڵەکانمان سەر لە دڵسۆزی دەشێوێنێت".

وێرانکەرترین چەك ڕم و هاوەن نییە، کە دەتوانێت جەستە بریندار بکات و دیوار لە بن بهێنێت. قێزەونترین چەك وشەیە، کە دەتوانێت بەبێ بەجێهێشتنی ئاسەواری خوێن ژیانێك وێران بکات، برینەکانیشی هەرگیز سارێژ نابن.

لەبەر ئەوە، با ببینە سەرکردەی زمانمان، نەك کۆیلەی وشەکانمان. گەر تەنانەت وشەشمان لەدژ بەکار هات، با نەچینە جەنگێکەوە، کە ناتوانین بیبەینەوە. ئەو ساتەی خۆمان دەخەینە ئاستی ڕکابەرە نەگریسەکەمانەوە، لە تاریکیدا دەست بە جەنگ دەکەین، لەو خاڵەتەشدا تاکە براوە خودای تاریکی دەبێت.

***

دڵسۆزی مرواریەکی ناو کۆمەڵێك دەنکە لمە، تەنها ئەوانەش دەیبینن، کە لێی تێدەگەن.

بەو شێوەیەش دەشێت تۆوچێنی دووبەرەکی هەزار جار بە هەمان خاڵدا بڕوات و هەرگیز ئەو خشڵە، بچوکە نەبینێت، کە ئەو کەسانە دەهێڵێتەوە، کە پێویستە بە یەکێتیی بمێننەوە.

هەرگیز دڵسۆزی بە زۆرداری، ترس، نادڵنیایی، یان تۆقاندن ناسەپێندرێت.

ئەوە هەڵبژاردنێکە، کە تەنها ڕۆحە بەهێزەکان توانای هەڵبژاردنییان هەیە.

لەبەر ئەوەش، کە هەڵبژاردنە، هەرگیز ڕێگە بە خیانەت نادات، بەڵکو هەمیشە بەخشندە دەبێت لەگەڵ هەڵەکانیدا.

لەبەر ئەوەی کە هەڵبژاردەیە، بەرگەی کات دەگرێت و کێشەکان دەگوزەرێنێت.

ئەوجا یەکێك لە گوێگرەکان، کە پیاوێکی
لاو بوو، بینی کە خەریکە خۆر دەچێتە خوار
ئاسۆوە و بەو زووانە چاوپێکەوتنەکەیان
لەگەڵ قبتییەکە کۆتایی
پێ دێت، پرسی:

"ئەی دوژمن چی؟"

## لەوەڵامدا گوتی:

***

ژیری ڕاستەقینە خەفەت لە زیندوو و مردوو ناخوات. لەبەر ئەوە، ئەو جەنگە قبوڵ بکە، کە لە سبەیدا چاوەڕوانت دەکات، چونکە ئێمە لە ڕۆحی نەمر دروست بووین، کە ئەوەش هەندێکجار دەمانخاتە دۆخی وەهاوە، کە دەبێت بەرەنگاری ببینەوە.

لەو ساتانەدا، هەموو پرسیارە بێ سوودەکان وەلا بنێ، چونکە تەنها بەرچاوی جەنگاوەرەکە خاو دەکاتەوە.

جەنگاوەر لە زەوی جەنگدا چارەنووسی خۆی بەڕێ دەکات، دەبێ خۆیشی بۆ ئەوە بەدەستەوە بدات. بەزەیی بۆ ئەو کەسانەی پێیانوایە دەبێت بکوژن و بمرن! وزەی پیرۆز وێران ناکرێت؛ تەنها بەسادەیی فۆرمی خۆی دەگۆڕێت. پیاوێکی زانای سەردەمی کۆن گوتوویەتی:

*"ئەمە وەك پلانێکی بڵند قبوڵ بکە و بەرەو پێش بڕۆ. جەنگەکانی سەر زەوی نابنە پێناسەی مرۆڤ، چونکە هەر چۆن با ئاڕاستە دەگۆڕێت، بەخت و سەرکەوتنیش ئاڕاستە دەگۆڕن. دۆڕاوی ئەمڕۆ دەبێتە براوەی سبەی، بۆ ڕوودانی ئەمەش، دەبێت شەڕ بە شانازییەوە لە ئامێز بگیرێت.*

*"هەروەکو چۆن کەسێك بەرگی نوێ دەپۆشێت و کۆنەکان وەلا دەنێت، بە هەمان شێوە ڕۆحیش جەستەی ماددیی نوێ قبوڵ دەکات و کۆنەکان بەجێ دەهێڵێت. ئەمە بزانە، نابێت لەپێناوی جەستەدا ئازار بچێژیت".*

ئەوە ئەو شەڕەیە، کە ئەمشەو، یان سبەی ڕووبەڕووی دەبینەوە. مێژوو ئەوە تۆمار دەکات، کە ڕوودەدات.

بەڵام لەبەر ئەوەی وا خەریکە بە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەمان دەگەین، نابێت کات لەوەدا بەفیڕۆ بدەین.

لەبەر ئەوە، حەزدەکەم لەبارەی دوژمنەوە قسیان بکەم: ئەوانەی بە تەنیشتمانەوە دەیاندۆزینەوە.

ئێمە لە ژیانماندا ڕووبەڕووی چەندین ڕکابەر دەبینەوە، بەڵام گرانترین بەزاندن ئەوەیە، کە لێی دەترسین.

ئێمە هەمیشە لە هەموو شتێکدا چاومان بە بەربەرەکانیکار دەکەوێت، بەڵام ترسناکترینیان ئەوەیە، کە بە هاوڕێی خۆمانی دەزانین.

هەموو ئازار دەچێژین کاتێك شکۆمەندیمان هێرشی دەکرێتە سەر، یان بریندار دەکرێت، بەڵام ئەو کەسانە دەبنە هۆی مەزنترین ئازار، کە پێمانوابوو نموونەیەکن، کە دەبێت شوێنیان بکەوین.

کەسمان ناتوانین خۆمان لە چاوپێکەوتنی ئەوانە بەدوور بگرین، کە خیانەتمان لێ دەکەن و لە پاشەملە باسمان دەکەن، بەڵام دەتوانین خراپەکاری دوور بخەینەوە بەر لەوەی دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆیمان نیشان بدات. دەشێت هەر ڕەفتارێکی لەڕادەبەدەر میهرەبان چەقۆیەك لە پشتی خۆیدا بشارێتەوە و ئامادەی بەکارهێنانی بێت.

ژن و پیاوانی دڵسۆز کاریان بەوە نییە ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان پیشان بدەن، چونکە ڕۆحە دڵسۆزەکانی تر لە چەندایەتی و کەموکوڕییەکانیان تێدەگەن.

وریای ئەو کەسانە بە، کە هەمیشە دەیەوێت ئاسوودەت بکات.

هەروەها وریای ئەو ئازارە بە، کە دەشێت خۆت ببیتە هۆکاریی بە ڕێگەدانی هاتنە ناوەوەی دڵێکی نەگریس و ترسنۆکانە بۆ ناو جیهانی تۆ. هەر کات خراپەکاری ئەنجام درا، هیچ حیکمەتێك لە سەرزەنشتکردنی خەڵکانی دیکەدا نییە: ئەو کەسەی کە دەرگاکەی کردەوە خاوەنی ماڵەکە بوو.

پاشەملەکەر چەندە شکستەنی بێت، هێندە کردارەکانی مەترسیدار دەبێت. خۆت بۆ ئەو ڕۆحە لاوازانە بێ هێز مەکە، کە توانای چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ڕۆحێکی بەهێزدا نییە.

ئەگەر کەسێك لە فیکرە و نموونەدا بەرەنگاری کردیت، هەنگاو بنێ و جەنگەکە قبوڵ بکە، چونکە ململانێ لە هەموو ساتێکی ژیانماندایە و هەندێك جاریش وا پێویست دەکات، کە لە ڕووناکی ڕۆژدا پیشان بدرێت.

بەڵام هەرگیز مەجەنگێ تا خۆت بسەلمێنیت، یان بۆ ئەوەی فیکرەکانت بەسەر کەسانی تردا بسەپێنیت. جەنگەکە تەنها وەك ڕێگەیەکی پاککردنەوەی ڕۆح و خاوێنی ویستت قبوڵ بکە. کاتێك جەنگەکە کۆتایی پێ هات، هەردوو لا وەك براوە دەردەکەون، چونکە هەردووکیان تاقیکردنەوەی توانا و سنوورەکانی خۆیان کرد.

گەر تەنانەت یەکەم جاریش یەکێکیان بڵێت "دەیبەمەوە" و ئەوی دیکەشیان غەمبار ببێ و لە بیری خۆیدا بڵێ "دەدۆڕێم".

چونکە هەردوو لا ڕێز لە ئازایەتی و هەتەریی یەکدی دەگرن، کاتی ئەوە هەر دێتەوە، کە دەست لە دەستی یەکدی پیاسە بکەن، گەر تەنانەت پێویستیش بکات هەزار ساڵ چاوەڕوانی بکەن.

لە هەمانکاتدا، ئەگەر کەسێك تەنها بیەوێت هانت بدات، تۆزی پێت بتەکێنە و بەردەوام بە. تەنها لەگەڵ ڕکابەرێکی بە نرخدا بجەنگە، نەك لەگەڵ کەسێکدا، کە فێل بەکاربهێنێت بۆ درێژەدان بە جەنگێك، کە دەمێکە کۆتایی پێ هاتووە، هەر وەك چۆن ئەمە جار جارە ڕوودەدات.

سەختی لەو جۆرە، لەو جەنگاوەرانەوە سەر هەڵنادات، کە لە زەویی جەنگدا چاویان بەیەکدی دەکەوێت و دەزانن بۆچی لەوێن، بەڵکو لەوانەوە، کە سەرکەوتن و بەزین بۆ کۆتایی خۆیان بەکاردەهێنن.

دوژمن ئەو کەسە نییە، کە بە شمشێرێکەوە لەبەردەمتدا وەستاوە. بەڵکو ئەو کەسەیە، کە لە تەنیشتتەوە وەستاوە و خەنجەرێکی لە پشتی خۆیەوە شاردووەتەوە.

گرنگترینی جەنگ لە لایەن ڕۆحێکی شکۆدارەوە هەڵناگیرسێت، کە چارەنووسی خۆی قبوڵ بکات. بەڵکو گرنگترین جەنگ ئەوەیە، کە ئێستا هەڵگیرساوە و زەویی جەنگییەکەی ڕۆحەکەیە و لەوێدا چاکە و خراپە، ئازایەتی و ترسنۆکی، خۆشەویستی و ترس ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە.

هەرگیز وەڵامی کینە بە کینە مەدەرەوە، بەڵکو بە عەدالەت وەڵامی بدەرەوە.

جیهان بەسەر دوژمن و هاوەڵدا دابەش نەکراوە، بەڵکو بەسەر لاواز و ئازادا دابەش بووە.

بەهێز لە سەرکەوتندا بەخشندەیە.

لاواز دۆڕاوەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە، نازانێت، کە بەزین تەنها شتێکی کاتییە. لە ناو دۆڕاوەکاندا، بە ڕواڵەت لاوازترین هەڵدەبژێرن.

ئەگەر خەریکبوو هەمان شت بەسەر تۆدا ڕووبدات، لە خۆت بپرسە ئەگەر بتەوێت ڕۆڵی قوربانی بە خۆت ببەخشیت.

ئەگەر وەڵامەکە "بەڵێ" بوو، ئەوا هەرگیز لە تەواوی ژیانتدا لەو هەڵبژاردنە ئازاد نابیت. هەروەها دەبیتە نێچیرێکی ئاسان هەر کات ڕووبەڕووی بڕیارێك دەبیتەوە، کە ئازایەتی گەرەك بێت. ڕەنگە وەك براوەیەك قسان بکەیت، بەڵام دیمەنی بەزیو هەر لە چاوەکانتدایە و هەموو کەسێکیش تێبینی دەکات.

ئەگەر وەڵامەکە "نەخێر" بوو، لە شوێنی خۆت بووەستە. وا باشترە هەتا برینەکانت چارەسەریان ئاسانە یاخی ببیت – گەر تەنانەت کات و ئارامیشی گەرەك بێت.

چەند شەوێکی بێ خەو بەسەر دەبەیت و بیر دەکەیتەوە: "من شایانی ئەمە نیم".

یان بیر لەوە دەکەیتەوە، کە چ جیهانێکی نادادپەروەرە، چونکە ئەو بەخێرهاتنەت لێ نەکراوە، کە چاوەڕوانت دەکرد، یان هەست بە شەرمەزاری دەکەیت لەبەرامبەر ئەو زەبوونییەدا، کە لەبەرچاوی [illegible] دایك و باوکتدا تووشی هاتوویت.

بەڵام ئەگەر بەخێرایی خۆت بگریت، ئەوا کۆمەڵە کەمتیارەکە وردە وردە دەجووڵێن و دەڕۆن بۆ کەسێکی تر دەگەڕێن تا ڕۆڵی قوربانییەکە ببینێت. دەبێت خۆیان هەمان وانە فێر بن، چونکە کەس یارمەتیان نادات.

***

لەبەر ئەوە، دوژمنەکانت ئەو ڕکابەرانە نین، کە لەسەر ڕێگەت داندراون تا ئازایەتیت تاقی بکەنەوە. ئەوان ئەو ترسنۆکانەن، کە لەسەر ڕاڕەوەکەت بەجێ هێڵدراون تا خاڵی لاوازیت دەربخەن.

ئێستا شەو باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە.
قبتیەکە ڕووی بۆ ئەو پیاوە ئاینیانە وەرگێڕا
کە گوێیان لە تەواوی ئەو شتانە گرتبوو، کە ئەو
گوتبوونی و پرسی گەر شتێکیان هەبێت تاکو
بۆی زیاد بکەن. هەرسێکیان سەریان ڕاوەشاند.

ڕاهیبەکە گوتی:

***

کاتێك ڕابییەکی مەزن بینی کە جولەکەکان بە خراپی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، ڕۆیشت بۆ دارستانێك، ئاگرێکی داگیرساند و نزایەکی تایبەتی خوێند، کە تێیدا داوای لە خودا کرد خەڵکەکەی بپارێزێت. خوداش پەرجوویەکی بۆ نارد.

دواتر، شاگردەکەی چوو بۆ بەشێکی دارستانەکە و گوتی: "سەرۆکی گەردوون، من نازانم چۆن ئاگرە پیرۆزەکە دابگیرسێنم، بەڵام نزا تایبەتییەکە دەزانم؛ گوێت لێم بێت، تکایە!" ئەوجا دووبارە پەرجووەکە ڕوویدایەوە.

نەوەیەك تێپەڕی، ڕابییەکی دیکە، کە دەیبینی چۆن خەڵکەکەی دەچەوسێننەوە، ڕۆیشت بۆ دارستانەکە و گوتی: "نە دەزانم چۆن ئاگرە پیرۆزەکە دابگیرسێنم، نە نزا تایبەتییەکەش دەزانم، بەڵام هێشتا شارەزای شوێنەکەم. ئای خودایا، یارمەتیمان بدە!" ئەوجا خوداش یارمەتی دان.

پەنجا ساڵ دواتر، ڕابییەکی پەککەوتە لەگەڵ خودا قسەی کرد، گوتی: "نە دەزانم چۆن ئاگرە پیرۆزەکە دابگیرسێنم و نە نزا تایبەتییەکەش

دەزانم، تەنانەت شوێنی ناو دارستانەکەشم بۆ نادۆزرێتەوە. هەموو ئەوەی دەتوانم ئەوەیە ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە و داوا لە خودا بکەم یارمەتیم بدات".

ئەوجا دووبارە پەرجووەکە بەدیار کەوتەوە.

بەرەو پێش بڕۆن و چیرۆکی ئەم ئێوارەیە بگێڕنەوە.

***

ئەوجا ئیمامی مزگەوتی ئەل ئەقسا بەڕێزەوە چاوەڕوانی ڕابییەکەی هاوڕێی بوو تا لە قسەکانی تەواو ببێت، دواتر گوتی:

***

پیاوێك لە دەرگای خانووی هاوڕێیەکی دەشتەکی دا و داوای چاکەیەکی لێ کرد:

"ئایا چوار هەزار دینارم دەدەیتێ تا قەرزێکی پێ بدەمەوە؟"

هاوڕێکەی داوای لە ژنەکەی کرد هەرچی شتی بەنرخیان هەیە کۆی بکاتەوە، بەڵام هێشتا بەس نەبوو. دەبوو بڕۆنە دەرەوە و سواڵی پارە لە دراوسێکانیان بکەن تاکو بڕی پێویستیان ئامادە کرد.

کاتێك پیاوەکە ڕۆیشت، ژنەکە تێبینی کرد مێردەکەی دەگری.

"ئایا بۆچی دەگریت؟ ئێستا کە قەرزداری دراوسێکانمانین، ئایا لەوە دەترسیت، کە توانای دانەوەی ئەو قەرزانەمان نەبێت؟"

"نەخێر، لەبەر ئەوە نییە. من لەبەر ئەوە دەگریم، کە ئەو هاوڕێیەکی ئەزیز و خۆشەویستە و هێشتاش نازانم ئەو لە چ تەنگوچەڵەمەیەکدایە. تەنها ئەوکاتە پێمزانی، کە هات بۆ قەرزکردنی بڕێك پارە لە دەرگاکەمی دا".

لەبەر ئەوە، بەرەو پێش بڕۆ و باسی
ئەم ئێوارەیە بۆ هەموو کەسێك بکە،
بەو شێوەیەش دەتوانین یارمەتی براکەمان
بدەین، بەر لەوەی ئەو پێویستی پێی بێت.

کاتێکیش ئیمامەکە لە قسەکانی تەواو بوو، قەشە مەسیحییەکە دەستی بە قسەکردن کرد:

***

تۆوچێنێك ڕۆیشت بۆ تۆوکردن. کاتێك تۆوی دەکرد، هەندێك تۆو کەوتنە قەراغ ڕێگەکە، باڵندەکانی ئاسمانیش هاتن تا هەڵیانبگرنەوە. هەندێکیش بەسەر زەوی بەردیندا ڕژابوون، کە خۆڵی تەواوی لێ نەبوو؛ ئەوجا لەناکاو هاتنە دەرێ، چونکە زەوییەکە بەباشی قووڵ نەبوو. بەڵام کاتێك خۆر هەڵهات، گەرمایەکی سووتەنی هەبوو، لەبەر ئەوەش، کە ڕەگی نەبوو، سووتا. هەندێکیش ڕژانە ناو دڕکەوە، کاتێکیش دڕکەکان گەشەیان کرد و گەورە بوون، تۆوەکان بەریان نەبوو. هەندێکیش چوونە سەر زەوی بەپیت و گەورە بوون و بەریان گرت؛ بەرەو پێش چوون و هەندێك سی بەر، هەندێك شەست و هەندێکیش سەدیان پێوە بوو.

لەبەر ئەوە، چوویتە هەر جێگەیەك تۆوی خۆت بچێنە، چونکە ئێمە نازانین کام تۆوە دەڕوێت و نەوەی داهاتوو گەشاوە و ڕەونەقدار دەکات.

ئێستا شەو باڵی بەسەر شاری قودسدا کێشاوە و قبتییەکە داوای لە هەمووان کرد بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان و هەموو ئەوانە تۆمار بکەن، کە

بیستوویانە، ئەوانەش، کە خوێندەوارییان نییە، هەوڵ بدەن وشەکانیان لەیاد بمێنێت. بەهەرحاڵ، بەر لەوەی ئامادەبووان بڕۆن، گوتی:

"وا بیر مەکەنەوە من هاتووم تا ئاشتی بەسەر زەوییدا بڵاوبکەمەوە. نەخێر، لەمشەو بە دواوە، ئێمە بە شمشێرێکی شاراوەوە گەشت دەکەین، بەو شێوەیەش دەتوانین لەگەڵ ئەهریمەنەکانی کەمبوردەیی و کەم تێگەیشتندا بجەنگین. هەوڵ بدە چەندە پێکانت هەڵیانگرتی ئەو شمشێرە لەگەڵ خۆتدا هەڵبگریت. کاتێکیش قاچەکانت توانایان نەما، شمشێرەکە، یان دەستنووسەکە بدە بە کەسانی تر، هەمیشە خەڵکانێك هەڵبژێرە، کە بەهای بەکارهێنانی شمێشرەکەیان هەبێت.

"ئەگەر گوندێك یان شارێك بەخێرهاتنی لێ نەکردیت، لەسەر ڕۆیشتنە ناوەوە سوور مەبە. بەو ڕێگەیەدا بگەڕێرەوە، کە لێوەی هاتوویت و تۆزی پێکانت بتەکێنە. چونکە ئەوان تاوانبار دەبن بە دووپاتکردنەوەی هەمان هەڵە بۆ چەندین نەوە.

"پیرۆزکراو ئەوانەن، کە ئەم وشانە دەبیستن، یان ئەم دەستنووسە دەخوێننەوە، چونکە نەگریسی لە سەرەوە بۆ خوارەوە داگیر دەکات، هیچ شتێکی شاراوەش نابێت، کە بۆت ئاشکرا نەکرابێت.

"لە ئاشتیدا بە".

**Paulo Coelho**

# MANUSCRIPT FOUND IN ACCARA

**Translated From English By:**

**Sirwan Mahmood**







www:endeshe.org | سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی
andesha.library@yahoo.com | تەلاری بازرگانی سیروانی نوێ
http//:wwwfacebook.com/Andeshalib | نهۆمی چوارەم
07501026400 | ناوەندی رۆشنبیریی وهونەریی ئەندێشە